




٩

# محرم محەمەد ئەمین
# لەشاری قەرەجەکان دا

نیگاری: علی جۆلا

بلاوکراوەیەکی ڕۆشنبیرییەو هەر ژمارەی تایبەتە بەداهێنەرێک
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم هەر دوومانگ جارێک دەری دەکات

دەستەی راوێژکاران
حسێن عارف
ڕەووف بێگەرد
ڕێبین ئەحمەد هەردی

سەرپەرشتی گشتی
شێرکۆ بێکەس

بەڕێوەبەری ڕۆڤار
دڵشاد عبدالله

کارگێر
عــوسمان شــەیدا

تایپ و مۆنتاجی کۆمپیوتەر
ئاسۆ سعید

## دەربارەی محرم و چیرۆکی گردی شەهیدان

کامەران موکری

خوشک و برا خۆشەویستەکانم: لەو دەمەوە کە کۆمەڵی ئادەمیزاد -بەگوێرەی ژیانی ئابووری- چینی (طبقی) تیا پەیدا بوە. وە چەوسانەوەو لەسەر ئەرکی یەکتری ژیان هاتوتە کایەوە، لەو دەمەوە کە ئادەمیزاد زیندانی بۆ ئادەمیزاد دانا و کوشتی بۆ دارشت، شۆرشێکی ئاگرین بەرپابوو. وە دانیشتوانی هەر شوێنێک لەسەردەمێکی مێژووییدا بە چەشنە شۆرشێک هەستاون، وە قوربانیان داوە.

کۆمەڵی ئادەمیزاد لەوەتی پێی ناوەتەوە قۆناغی (مەدەنیەتیەوە) تا ئەمڕۆ، هەر بەچەنگی خوێناویەوە. ڕەوڕەوەی مێژووی پاڵ پێوە ناوە بۆ پێشەوە، وە هەر لاشەی شەهیدان بوە فەرشی ڕێی ئازادی

کۆمەڵی ئادەمیزاد، نەتەوەکان، تا چەوسانەوەو زۆرداری نەنێنە چاڵەوە. تا کوتی دیلی نەدەن، زەبری کۆمەڵایەتی و بەگژیەکا چوونی (چینی زۆردارو زۆرلێ کراو) کۆتایی نایەت. لەم تێکۆشانە سەختەدا، کە نەتەوەکان کۆمەڵی ئادەمیزاد پێی هەستاون وە پێی هەڵئەسن لە هەموو چەرخێکا قوربانیان داوەو ئەیدەن هەمیشە، لەهەموو سەردەمێکی مێژوویدا، وشەی (شەهید و ئازادی) دوو وشە بوون پێکەوە لکاو

نەتەوەی کوردیش وەک نەتەوە ئازادی خوازەکانی جیهان وەک عەرەبی دۆست، زۆر جار لەپەرستگەی ئازادیا قوربانی خۆی پێشکەش کردووە

کاتێ کە چاوێک بە مێژووی گەلی کوردا ئەخشێنین لە گەل هەناسە هەڵکێشانا بەسەر بەرزیەوە ئەڵێین (ئەگەرچی فرمێسک ئەرژێن بۆ ئەوانەی لەرێی گەلا کۆچیان کرد. بەڵام شانازیە کە بەخوێنی گەشیان ٦ پەڕەی مێژوومانیان ڕەنگ کرد،

هاورێینە:

بەرزترین قوربانی، بەهێزترین خۆبەخت کردن ئەوەیە، کە لە پێناوی گەلا. (ئادەمیزادا) ئامانجی گەل و ئادەمیزاد بێت. ئەو کەسەی کە لە پێناوی گەلا (کۆمەڵی ئادەمیزادا) ئەمرێت، ئەگەر چی بشبێت بە خۆڵ و (با) بیکا بەسەر گەلاو لوتکەی کەژا. تا ماوەیەکی یەکجار زۆر لە مێژوودا تا (هەزاران ساڵ، ناوی هەر ئەمێنێ

خوێندەوارە خۆشەویستەکانم:

ئەگەرچی لە مێژوودا هەبوە (گەل، لە ئەنجامی زۆرداری و (زوڵمێکی تایبەت) تواوەتەوە. وە زمان و ڕەوشتی تایبەتی هەمو جۆرە (شێوەیەکی) نەماوە. بەڵام ئەمڕۆ، لەم چەرخەدا، کەچەرخی بزووتنەوەی (نەتەوایەتی) چەرخی (هەقی) نەتەوایەتی پاراستنە، هەموو نەتەوەیەک هەوڵ ئەدات کە بە برایەتی، لە سایەی ئاشتیا بژی، لەم نەتەوانەش کورد، کە بەبرایەتی (هەوڵ ئەدات) لەگەڵ گەلی عەرەب و گەلانی ئازادی خوای ڕۆژهەڵاتی ناوەندا.

نیمەی (کورد بە سەدانمان یا لەسەر قەنارە، وە یان بە گوللە لە پێناوی کوردو برایەتی (کوردو عەرەبا) گیانیان بەخشیوە وە هەمووی هەربرێقێن بوو، کە ((هەمزە حەسەن) لە شەوە زەنگی زۆرداریا کرا بە(قوربانی گوللە)، سەر-شۆرە چەوسێنەرەکان (هەمزە حەسەن)ی جوانە مەرگ شەهیدێکی ئەم نیشتمانەیە چونکە ئەم قوتابیە لاوە، کە تەمەنی هەر (١٨) ئەبوو، بۆ گەل و (جوتیار) کە زۆربەی گەلن تێ ئەکۆشا و رەنجی ئەدا، وە هەر بەدەستی دوژمنانی گەل و (جوتیار) وەک میوەیەکی تازە گەیشتوو لە درەختی ژیان کرایەوەو هاویشترایە، ئاو ناوی یادو شانازیمەوە.

هەمزە

برا گیان، هەمزە نوێترین شەهیدمانە، بۆیە بە پێویستم زانی لەم چەند دێرەدا ناوی بەرزی بەرم.

براو خوشکی خوێنەوارم:

لام وایە بچووکی ئەم چیرۆکە (خنجیلەیە) هەر ئەوەندە ڕێم ئەدا کە ئەم چەند دێرە کەمەی لەسەر بنووسم، تکا ئەکەم بەوردی بیخوێننەوە. بە قووڵی سەرنجی لێ بدە چونکە چیرۆکێکە کە ئەژمێرێت بە نموونەیەکی نایاب لە چیرۆکی نیشتمان پەروەری. وە شایانی ئەوەیە کە وەک ئەو چیرۆکانە سەیر بکرێت کە لەناو جەرگەی (گەلەوە) هەڵقوڵاون

چونکە ئەم چیرۆکە ئەگەر چی باسی ڕووداوێکی (دیاری کراو) نیە. بەڵام نموونەیە کەبۆ سەدان بەسەرهاتی وا کە لە نیشتمانی ئێمەدا ڕوویداوە. زۆر جار نیشتمان داگیر کراوە، دوژمن خاکمانی کردوە، بە پێشێل، مناڵەکانی کردوە، بەسەری سوتاندیا، شارەکانی وێران کردووە، زۆر جار ڕۆڵەی ئەم خاکە هەزارانیان دەربەدەرو بێ سەرو شوێن بوون

ناوی دانەوەیەکی لەرابردوو، لە (دەبۆکەی) جاران لە گردی (یارە) لە (بازیان). هتد. وە زۆر شوێن و کاتی تر، سەدان نموونەمان ئەخەنە بەر چاو لە ڕووداو چەشنە بەسەر هاتێک وەک هی ئەم چیرۆکەی کاک محرم

خوێندەوارە بەرێزەکانم:

لام وایە پێویست بەوە ناکا، وکاک محرم محمد لمین، تان پێ بناسێنەو پێشکەشتانی بکەم چونکە لە چیرۆکی (گۆمی شەڵەلار)و (مام هۆمەر)و نوسینە وردە کانیاو، تەرجەمە بە نامەکانیا ئەیناسن

((پێنەکی کتێبی گردی شەهیدان))

## علی جۆلا

١٩٤٢ لە هەڵەبجە لەدایک بووە

١٩٦٦ ئەکادیمیای هونەرە جوانەکانی بەغدای تەواو کردووە

١٩٦٨-١٩٩٨ حەوت پێشانگەی تایبەتی لەبەغداو هەولێرو سلێمانی کردۆتەوە

١٩٧١ پێشانگەیەکی لە مەڵبەندی ڕۆشنبیری سۆڤێتی لە بەغدا کردۆتەوە

بەشداری پێشانگەی هاوبەشی هونەرمەندانی کوردی کردووە لە ئەڵمانیا و ئینگلتەرەو ئیتاڵیا و کەنەدا و هۆڵەندا

١٩٩٥ تا ١٩٩٧ بەشداری هەرسێ خولی گەلەری زەموای کردووە

-بەشداری یەکەمین پێشانگەی هەمیشەی گەلەری ئەربیلای کردووە

-بەشداری گشت پێشانگەکانی هونەرمەندانی سلێمانی کردووە

-سەرۆکی یەکێتی هونەرمەندانی یەکگرتووی کوردستانە

-سەرۆکی بەشی شێوەکارییە لە کۆلێژی هونەر لەزانکۆی سلێمانی

(ڕوڤار) بڵاوکراوەیەکی ڕەخنەییە
هەر ژمارەی ناییەنە بە داهتەرێک
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم هەر دووهانگ جارێک دەری دەکات
ناونیشان
سلێمانی -تونکەی بەکرەن- دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، ڕوڤار
ت/ ٢٩٦٠٩-٢٩٨٣٩
لەدەرەوەی کوردستان
Tel: 00441628460008 Fax: 00441628477660
چاپخانە: ئەسعەدی دلم

# چیرۆکنووس

## ( محرم محەمەد ئەمین )



*١٩٢١ لە گەڕەکی دەرگەزێن-ی سلێمانی لە دایک بووە.

*١٩٣٦ خوێندنی سەرەتایی تەواو کردووە.

*١٩٤٣ قۆناغی خوێندنی سانەوی خوێندنی تەواو کردووە.

*(١٥) ڕۆژ لە کۆلیجی حقوقی بەغدا دەوامی کردوەو جێی هێشتووە.

*١٩٤٤ لە دائرەی تەموینی سلێمانی ئیستخدام کراوە.

*لەنێوان ١٩٤٥ تا ١٩٧٤ فەرمانبەر بووە لە دائرەی مەعاریف و نامەخانەی گشتی قەزای (خالص)و دائرەی لەناو بردنی مەلاریا و شارەوانی سلێمانی و دوا جاریش بۆ سەرۆکی شارەوانی.

*لە ساڵی ١٩٧٥ لە دەزگای بڵاوکردنەوەی کوردی (هاوکاری و بەیان)کاری کردووە.

*١٩٧٦-١٩٧٧ خانەنشین کراوە.

*١٩٦٠-١٩٦١ ئەندامی نووسەرانی گۆڤاری (ڕۆژی نوێ) بووە.

*تێکەڵ بەکۆڕی تێکۆشان بووە، بەتایبەتی بزوتنەوەی سوشیالیستی.

بەرهەمەکانی :

*١٩٥٤ یەکەم چیرۆکی بەناوی (مام هۆمەر) بڵاوکردەوە لە نامیلکەیەکی سەربەخۆدا و لە هەولێر لە چاپخانەی کوردستان چاپکراوە.

*١٩٥٧ گۆمی شڵەقاو / بەغدا چاپخانەی ئەسعەد.

*ساڵی ١٩٥٣ لە ڕۆژنامەی ژین چیرۆکی (سەیرانێك لە ئەزمڕ)ی بەچەند ئەڵقەیەك بڵاوکردۆتەوە.

*شای قەرەجەکان چیرۆك

*گردی شەهیدان چیرۆك.

*یادی گۆڕستانەکە ڕەرگێڕان- چیرۆکی دیستوفیسکی.

*مەبدەئە بنەڕەتیەکانی فەلسەفە وەرگێڕان- لە عەرەبی یەوە.

*ڕێگای ئازادی چیرۆك.

*ئادەمیزاد چیرۆك.

شۆڕشی بارزانی- وەرگێڕان-١٩٤٥.

*هەندێك چیرۆکی گۆگۆڵ و گۆرکی کردۆتە کوردی و لە (ژین) و (هەتاو) دا بڵاوی کردوونەوە.

*چەندین وتاری ئەدەبی و کۆمەڵایەتی و سیاسی لە گۆڤارو ڕۆژنامەکان دا بڵاوکردۆتەوە.

*٢٣/تەموزی/١٩٨٠ لە ئەمنی سلێمانی لەسەردەمی ڕژێمی دکتاتۆری دا لەژێر ئەشکەنجەدا دڵی لەلێدان وەستاو بەیەکجاری ماڵئاوایی لێکردین.

# چیرۆك

## سەیرانێك لە ئەزمڕ



هەردووکمان لە کۆڵانە باریکەکەی پشت چێشـتخانەی وەسـتا گـوروون لەسـەر قەنەفەیەك لە قەنەفەکانی چایخانەکەی حاجی بارام دانیشتبووین، لەبەر تیشکی گڵۆپـی کۆڵانەکە چاومان قیچ ئەکردەوە بەو پارچە قاقەزە چڵکنـەدا کە ئەوساتە ڕێبوارێکـی ناسیاو دابوویە دەستمان.

هـەرچی چۆنێـك بـوو تـێی گەیشـتین، حەمەوەیسـی برادەرمـان مژدەدەمـان ئەداتـێ کـە سبەینێ دێتەوە. لەپاش خوێندنەوەی نووسراوەکە هەردووکمان چاومان بڕیە یەکتری، تاماوەیـەك بێ ئەوەی ووڕتە لەدەممان بێتە دەرێ، ماورێکەم پەیتا پەیتا پووشی لە حەسیری قەنەفەکە دەردەهێنا و دانی پێ ئەناژنی. وادیـار بـوو ئـەویش وەکو من بەخـەیاڵی فڕیبـوو بۆ دوومـانگ لەمـەو پێـش کـە هەرسێکمان هەر لەسـەر ئـەم قەنەفەیـە شـەوێك بۆ قیوڕلـی و بامییـەك ئـاو زابـووە دەممـان، کـە لـە چێشـتخانەکەی ئـەو بەرمانـەوە بۆنـی بەسـەرمانا ئـەهات، بـەڵام ڕووی ئـەبوونی ڕەش بـێ، ئەسـپێ لەباخەڵمانا سەوزە لە گیانمی ئەووت. بۆ ئەگبەتیش کەسێ ئـەبوو مـەولوودێك بکـات. حەمـەوەیس لـەو لاوە لەسەر زگا پاڵ کەوتبوو سەری خستبووە سەر لەپی هەردوو دەستی لەبەرخۆیـەوە گۆرانییـەکی هەورامیانەی ئەووت لێی تێ ئەئەگەیشتین.

بۆ سبەینێ ئێوارە کە حەمە وەیس هاتەوە هەر لە دوورەوە سمێڵـە قەیتانیەکـەی بسکـەی ئـەهات و سەرێکی بە دەستیەوە بـوو لـووڵ ئـەدا، کـە نزیـك بوەوە بە زەردەخەنەیەکەوە ووتی:

–هەسـتن بەرخۆڵـەکانم، ئـەم ئێوارەیـە لـەو چێشتخانەیە لای گەورەی خۆتان میوانن.

ئەو شەوە ئەوەندەمان خوارد تا ملە مای زگمان نیشت. وەهەر لەو شەوەوە حەمەوەیسمان ئەدیەوە، لە پاش چەند ڕۆژێك بیستمان لەبەر دزینی جووتێك پۆستاڵی سەربازێك دوو مانگ بەند کراوە.

برادەرەکەم خەیاڵی بڕیەو ووتی:

–حەمـە وەیـس هـەقی بەسـەرمانەوە زۆرە، بەبۆنـەی هاتنـەوەی سـەیرانێکی بۆ ئەکـەین، خـوا ڕەوای بینی ئێستا دەستمان ئەڕوا.. ووتم:

–مچە، ئەگـەر خایـەو مایـەمان بـۆ ئـەو دابنێـین کەمـە، بیرەکـە زۆر بەجێیـە، ئاسـەیری پریاسـکە کەمان بکە بزانە چەندی تیایە؟

کاتێکم زانی مچە بەچەقەنـە لێدانـەوە ڕاست بووەوەو دەنگی بۆلەراندەوە:

–سێ دینارو نیو.. سێ دینارو نیو..

هـەرچی چۆنێـك بـوو دام مرکانـەوە، لەپاشـا کەوتینە باسی جێگار ڕێکخستنی سـەیرانەکەمان، لە پـاش چەنـەبازییەکی دووڕو درێـژ کە تـا نیوە شەوی خایاند بڕیارماندا بە ئۆتۆمبیلێکی ئرتونوێ ڕۆژی هـەینی بەهـەموو کەلوپـەلێك و خواردنـەوەوە بچین بۆ (ئەزمڕ)[1]. حەمـەوەیس لـەم ماوەیـەدا هیچ نـەگۆڕا بـوو، چـی لـە بـەکار هێنـانی ووشـەی (بەرخۆڵەکانم) کە بەزمانی ڕاهاتبوو، وە چی لەجل و بـەرگیا بەکلیتەکەیـەوە کـە وەکـو قـەیلاخی تورکستانیەکان لەسەری ئەکرد، وەسمێڵـە باریك و درێژەکەی کە ئەوەندەی ئەمابوو هەر دوو سەری لە گوێکانی ڕەت بێ. لەدەشتی وەیس[2] کە لەپشتی لۆریەکە هاتە خوارێ، ووتی:

ها! چۆنن بەرخۆڵـەکانم! شەیتان ئـ ـێ سـەرو یخورمەتان تێسرەوێنم، ئەئەبو سەرێکم دەن! ئێستاش هـەر لـە ئوتێل بـارامن؟ (بەچایخانەی حاجی بارام کەلەسەر قەنەفەکانی شەو ئەئووستین ئەووت ئوتێل بارام).

هەرچییـەکی ئەپرسـی بـەڕێکاوە وەڵامـمـان ئەئاگیـەوە، تـا گەیشـتینەوە ئوتێـل بـارام، هێشـتا ماندوومـان ئەحاسـابۆوە کـە مچـە لەڕزانـە لەبـەر ئەممانا وەستاو کەمەری بۆ لەرانینەوە ووتی:

–حەمەوەیس بۆ بۆنـەی هاتنـەوەی تـۆوە ڕۆژی هەینی ئەچین بۆ (ئەزمڕ) . عەرەقیش ئەخۆینەوە.. ئەوەتەی تۆ ڕۆیشتووی لێومان لێ ئەداوە.

حەمـەوەیس کـە ئەمـەی بیسـت بەپەنجـەی سـەرێکی سمێڵـی هێنایـە خـوارەوە بـە بادانیـەوە دووسێ کەڕەت ئەمەئمی کردو لەپاشا ووتی:

ئـەڵێی ئێستا پـارە لای ئێـوە وەکـو کـا وایـە بەرخۆڵەکانم؟ ئەبێ دەرامەتیتان باش بێ؟

ووتم، ئەوەندەی تۆ بەجێت هێشتووین لەسایەی خواو هـێزی بازووی خۆمانـەوە لـەهاتاین، بـەهۆی ئۆتۆمبیل زۆریەوە بووم بە ئاتری ئۆتۆمبیل، ڕۆژی چوار پێنـج ئۆتۆمبیـل ئەشـۆم بەمـە شـتێك پـەیدا ئەکەم.

حەمە وەیس ووتی:

–بـەخوا مـەئمووری یـەتێکی نایابـە! ئـەی بەرخۆڵەکەی ترم بەخێرێ کاری چییە؟

مچە لەڕزانەئەی خستە بەر من وەڵامی بدەمەوە کە چەنا گە درێژەکەی هێنایە پێشەوەو ووتی:

–بەرخۆڵەکـەی تریشـت ئیشـی زۆر باشـە.. لـە پەنجەرەکەوە سەیری ئـەو قوژبنـەی ژوورەوە بکـە.. ئـەها ئـەو قیر تەبەقـە.. ئـەوە چـەند مـاجوورمی و لەبزینـەیەکی مێـش تێمروکـاوی لەسـەرە؛ بـەڕۆژ ئەیگێڕم، لەبەرلوە ی' هەرکەسێکا ڕام گرت لە ترسی ئەوەی هێڵنج ئەدا ئەست بە جێ دەفلسم ئەداتێ. ماجوورمی و لەبزینەکەش هەر بە جێگای خۆیەتی، ' مـ ئەموستی بۆ نابا. وە ئەگەر تریمان لەسەدا یەکێك ' ' ەکاتەوە هەر کەرووتم نازێن. ئیتر بەسـە بـۆ ئـەوەی پارەیـەك فـڕێ بداتـە ئـاو قیرتەبەقەکەمەوە، ئاوا ئەبێ ئیش کردن بەس نییە سوال ناکەم.

حەمەوەیس دەستی دا بەپشتی هەردووکمانا، ووتی:

-بڕۆن بەرخۆڵەکانم، منیش نیشێکی باشم بۆخۆم دۆزیوەتەوە، ئەمە دووسێ ڕۆژ لەپێش بەربوونما بیرم کەوتۆتەوە، هەموو نیوە شەوێک لەبەریانەی مووچەخۆرانا[*] ڕائەوەستم، ئەوانەی دارە[*] ئەکەن، ئەچمە بن باڵیان تا بەردەرگای ماڵی خۆیان ڕەوانەیان ئەکەم، لەباتی ئەو چاکەیە دەستی بەگیرفانیانا ئەگێڕم، خۆیان تاقەتیان نی‌یە دەست بکەن بە گیرفانیانا، بەم جۆرە هەرسێکمان بووین بەخاوەنی ئیش، من مووچەخۆر بەرەوەی پاش نیوە شەو، تۆ ئاتری ئۆتۆمبیل، مچە لەرزانەش ماجوومی فرۆشی تازە بابەت. بەڕاستی گرێی بەختمان کراوەتەوە، ئیتر لە سبەینێوە هەر کەس ئیشی خۆی نەبیرم کەوتەوە، بەیانی سەیرانی ئەزمڕە، لە دوویەیانیەوە..

بەیانی کە ڕۆژی هەینی بوو بەخۆمان و کەلوپەلمانەوە بەسواری ئۆتۆمبیلی نرتونوی بەرەو ئەزمڕ کەوتینە ڕێ، کوشنی ئۆتۆمبیلەکە زۆر نەرم و شل بوو، مچە لەرزانە هەر کە لەسەری دانیشت ووتی:

-بەکەللەی هەرسێکمان درۆ ناکەم ئەمە لە توکی قوو دروست کراوە.

کە گەیشتینە ئەزمڕ لە گوێ حەوزەکە تاقمی ئەفەندی دانیشتبوون ئەیانخواردەوە لەبەختی ئێمە جێگای سێ کەسێ بەتاڵ بوو، ئەت ووت بۆ ئێمە تەرخان کراوە، سڵاومان کردو دانیشتین، تا چارەکە سەعاتێک هەرسێکمان گوێ قوڵاغ بووین بەخێرهاتنمان بکەن، بەڵام دەنگ نەبوو، ناچار حەمە وەیس ووتی:

بەخێرهاتێن سەر هەر شەش چاومان خۆ حۆمان زمانمان ئەگیراوە بەخێرهاتنی خۆمان بکەین

ئەفەندی‌یێکی وورگنی کورتە بالای چاویلکە لە چاویان تیابوو، دەستەسڕێکی سپی دا بوو بەسەر ئەژنۆیا هەر لێمان مۆڕ ئەبۆوەو لچی لێ هەڵئەقورتاین، لەپاشا بەدەست یاساوڵەکەی ئەزمڕی بانگ کردو شتێکی بەگوێ یا چرپاند، ئەویش دەست بەجێ هاتە لامان و ووتی:

-بن ئەو درەختەی خوارەوە جێگایەکی زۆر خۆشە، ئەم جێگایەی ئێوە گیراوە.

حەمەوەیس مۆڕ بوو، خەریک بوو لاساری بکا، بەڵام من دەستێکم تێوە ژەندو ووتم:

باهەستین جێگا هەر جێگایە.

کە هەستاین بڕۆین، یاساوڵەکە ئەختێک ئامۆژگاری کردین، کە لەناو خۆمانا ئەچین بەگژ یەکا وەزەوق لەوانی کەش تێک ئەدەین.

لەبن درەختەکە مەزەمان ڕازاندەوەو کەوتینە پێک هەڵدان کەسەرمان ئەختێک گەرم بوو مچە لەرزانە دوای ئەوەی پێکێکی هەڵداو بەقۆڵی سمێڵی سڕیەوە، ووتی:

-گوێ مەدەنێ.. بەم کەللەیە هەر خۆمان ئەیبەینەوە! جاری ئەمردین لەلووتکەی گۆیژە[*] دانیشتین.. خوا کەریمە بۆ ئەوانی تریش..

حەمەوەیس کە کلیتەکەی کرد بوو بە ئەژنۆیا، وە چاوی بڕیبوە ئاسۆ، ئەم ووتانەی مچە لەرزانە هێنایەوە هۆش خۆی، پێکێکی هەڵداو ووتی:

-هەر ئەمەت مابوو مچە لەرزانە، ئەوەکەی بوی بەفەیلەقوچ بەرخۆڵەکەم؟! ئەوانی ترو مەوانی ترنیە. بخۆرەوە تارەکو باڵندە باڵ دەرئەکەیت و ئەفڕی بەم ئاسمانەدا، مەبەس لەخواردنەوە هەر ئەمە نی‌یە! گوێ بگرن بەرخۆڵەکانم یا قەتارێکتان بۆ...

لەدەنگی قیژە حەمەوەیس قسەکەی قووت دایەوە. کەسەیرمان کرد چاومان بەدیمەنێکی سەیر کەوت، ئەفەندی‌یەکان دەستیان لەیەخەی یەکتری گیر کردووە، هەر کورسی‌یەو بەرز ئەبێتەوە. پیاڵەیە زرەی دێ، جنێوە لەدەم ئەبارێ، ئیتر مەپرسە. کردبوویان بە ڕۆژەکەی قەرەوەیس.

ئێمەش دامان بەخۆمان نەگرت، هەرسێکمان گەیشتینە لایان ناوبژیان بکەین، بەهەر کێشە کێشێ بوو لێکمان کردنەوە، وە لە جێگای خۆیان دانیشتنەوە، لەپاش ئەوەی ئەختێک سەرو پۆتاڵی ئێمەشی تیا کوترایەوە. ئەفەندی‌یە وورگنەکە چوار چێوەی چاویلکەکەی بەدەستەوەبوو، سەیرێکی کردین و لەپێش ئەوەی بێتە قسە وورگی وەکو مووشەدەمە کەوتە هات و چۆ، لەپاشا وەکو هەورە تریشقە گرماندی، مچە لەرزانە داچڵەکی فرسەقی چوو بەئاسمانا.

بەسە بەرچاومان بەردەن ئیتر، ئێمە لە ناوخۆمانا یاری ئەکەین نازانم ئەمانە هەقیان چی‌یە بەسەرمانەوە.

بەزاتی خوا ئیمڕۆ ئەم سێ سواڵ کەرە لێیان تێک داوین، پێم ناڵێن ئێوە قنچکی پیازن، یا سەرکی سیر؟!

حەمەوەیس کە ئەفەندی ئەم قسانەی لەدەم ئەباری، زەق زەق سەیری ئەکردو سمێڵی با ئەدا، لەپاشا کە ئەفەندی بێ دەنگ بوو، لێی چووە پێشەوە، لەسەر خۆ پێی ووت:

-بەرخۆڵەکەم چاوە زیقە تووڕەیی‌یەکانت باش بکەرەوە، با تێت بگەیەنم ئێمە چین! ئێمە سواڵ کەر نین! ئەم هاوڕێ یەم ئاتری ئۆتۆمبیلە، ئەوەشیان ماجوومی فرۆشی تازە بابەتە، منیش شەوێک ئەبێ بەخزمەتت بگەم، ئیشم..

ئەم هێشت حەمە وەیس زۆر لەسەری بڕوا، پەلم گرت و گەڕاینەوە جێگاکەی خۆمان، کەدانیشتینەوە حەمە وەیس قاپێ عەرەقی سەر مێزی لە باخەڵی دەرهێنا، ووتی:

-ها بخۆنەوە، عەرەقمان نەماوە ئەمەم لەژێر مێزەکەیان دەرهێنا، ئەمە ماڵی دزێتی نی‌یە، هەقی خۆمانە، ناوبژیمان کردوون، مچە لەرزانە کە چاوی بەقاپەکە کەوت، ڕووی گەشایەوە قسەکەی بەحەمە وەیس بڕی کە هەڵی دایە:

خوا نەخواستە چی گەوچێک ئەڵێ ماڵی دزێتی‌یە!

من ئەزانم حەمە وەیس، تۆ پیاوێکی دانای بەو نیازە ئەم قاپەت لێ دزین، نەء، دوور لەڕووی تۆ.. لێ شاردنەوەکە زیایە خۆری ئەکەن، نۆشی کەن! ئازیز نۆشی کەن ختورە بەدڵتانا نەیێ..

شەو درەنگ بوو کە گوێمان لەهۆڕنی ئوتومبیلەکەمان بوو، بانگی ئەکردین بمان بەنەرە، کەسەر کەوتینە سەری ئەبینین گوێ حەوزەکە کەسی لێ نەماوە لە ئەفەندی‌یە وورگنەکە بەولاوە، چوار مشقی لەسەر زەوی دانیشتووە دەستە سڕێکی گرتووە بەچاویەوە زوڕە زوڕ ئەگری، کابرای یاساوڵیش بەدیاریەوە هەل تووتاوە قسەی لەگەڵ ئەکا کەنزیک بووینەوە یاساوڵەکە ڕووی تێ کردین و ووتی:

-خێرتان ئەگا ئەم ئەفەندیە لەگەڵ خۆتان بەرنەوە، لەبەر سەر خۆشی لەو پەنایە خەوی لێ کەوتبوو، کاتێ خەبەری بۆتەوە هەڤاڵەکانی ڕۆیشتوون، بەجێ یان هێشتووە، دیارە ئەوانیش زۆر سەرخۆش بوون لەبیریان چووە. لەم گلتو گۆیە ئەفەندی ئەختێ هۆشی هاتەوە بەر، کەدەستە سڕەکەی لەسەر چاوی لابردو ئێمەی بینی وەکو قرژاڵ هەردوو چنگی قژ کردەوە هاواری کرد:

-لێم گەڕێن، لێم گەڕێن لەگەڵ ئەمانە ناڕۆمەوە.. ناڕۆمەوە، ئەم کوژن، ڕوتم ئەکەنەوە، حەمە وەیس دەستی دایە قۆڵی، ووتی:

-مەخابن نی‌یە بەرخۆڵەکەم چۆن ئەت کوژین! هەستە بابڕۆینەوە، بەسەری خۆت ئەتبەینەوە.

بەهەرسێکمان ئەفەندی‌مان هەستانە سەر پێ و بەهەر شەڕە شەقی بوو لەپشت ئوتومبیلەکەوە لەنێوانی من و مچە لەرزانەدا دامان نا!

حەمەوەیسیش لەپێشەوە سوار بوو. لەڕێگا لەبەر لەرینەوەی ئوتومبێلەکە کە دەستمان ئەکەوت لەجێگایەکی ئەفەندیەکە وەکو کێچ ڕائەپەڕی، خۆ کە ئوتومبێلەکە لەپێچێکا ئەختێ ڕەوتی هێواش ئەبوو وا ڕائەپەڕی سەری لەبن میچەکە ئەکەوت و ئەی قیژاند و لێمان ئەپاڕایەوە بەسەزمانە وای ئەزانی ئوتومبیلەکە ڕائەگرین بۆ ئەوەی تەوەنێکی پێ بدەین، ئیتر زەلالەتمان بوو بەدەستیەوە تا لەشار نزیک بووینەوە ئەوسا ئەفەندی ئەختێک زیتەڵە بوەوە، بەڵام مچە لەرزانە بەناخێری لەم درا قۆناغەی، نزیع - نۆیعی لێ هەڵسا، هەرچی لەزگیا

ڕۆڤار

بوو ڕژاندی بەسەر پانتۆڵی ئەفەندی‌دا، خوا هەڵناگرێت ئەویش هیچ پێی تێک نەچوو ئەوەندە نەبێ ووتی:

قەی‌ناکا هەر سەر سەلامەت بێ، هەر سەر سەلامەت بێ، کە ئوتومبیلەکە لەبەر ئوتێل بارام دا وەستا، حەمەوەیس ووتی:

کەس بەهیچ لایەکدا نەڕوا بەرخۆلەکانم، ئا! تۆ ئەو تەنەکە ئاوە لەو لاوە دانراوە بیکە بەئوتومبیلەکەیا ئافەرین، لەبیرت نەچێ هەقی ئاتریەکەشی لەکرێی ئوتومبیلەکە داشکێنێ. ئوتومبیلچی‌یەکە بەزەردەخەنەیەکەوە پارەکەی خستە باخەڵی‌و ئوتومبێلی لێ خوڕی.

ئەفەندیەکەمان خەریک بوو بڕوا، بەڵام حەمە وەیس پەلی گرت‌و لەسەر قەنەفەکە دایناو پێی ووت:

-جارێ دانیشە ئەفەندی: شەرمەزارمان مەکە، ئێمە میوان پەروەرین تا ئەمکمان نەکەی نابێ بڕۆی، ئا مچە لەرزانە خێراکە..

مچە لەرزانە ئەوەندەی بلێی یەک‌و دوو قێر تەبەقەکەی لەبەردەما ڕاگرت، ئەفەندی کە چاوی بە ماجومی‌یە مێشاویەکە کەوت وەختەبوو جەرگ‌و هەناوی بێتە دەرێ دەستی لەراندەوە، وە بەفیزێکەوە ووتی:

-سپاستان ئەکەم، ناخۆم، ناخۆم..

حەمەوەیس ئەختێک لێی چووە پێشەوەو دەستی خستە سەرشانی‌و پێی ووت:

-بەم کەللەیە ماجومیەک هەر دەخۆی، دەمت بکەرەوە ئاوا.. چاوت بنوقێنە..ئافەرین.. قوت چوو.. قووت چوو.. ئەوەتا لەقوڕقوڕاگەتەوە چووە خوارێ، حەمە وەیس هەستایە سەرپێ‌و ووتی:

-ئینجا ئەفەندی فەرموو با بڕۆینەوە ئەفەندی هەرچەند ویستی خۆی بەتەنها بڕواتەوە، بێ‌سوود بوو حەمەوەیس بەزۆر چووە بن هەنگڵی‌و لەگەڵ خۆیا بردی لەپاش نیو سەعات حەمەوەیس گەڕایەوە نیو دیناری دەرهێناو ووتی:

-گیرفانی پێنج دیناریەک‌و ئەم نیو دیناریەی تیا بوو، پێنج دیناریەکەیم بۆ خۆی لەگیرفانیا گل دایەوە، ئەم نیو دیناریەش، دە فلسی هەقی ماجومیەکەی مچەلەرزانەیە، ئەوی تریشی کرێی خۆمە ها بەرخۆلەکەم بیخەرە ناو پریاسکەکەوە، ئەم ئەزانی لە ئیمشەوەوە هەرسێکمان ئەچینە سەر ئیشی خۆمان، ئیتر با بنووین بەرخۆلەکانم، وا کەڵەشێر خوێندی!.

***

*ئەزمڕ سەیرانگایەکە لەسەر شاخی (گۆیژە) نزیک سلێمانی.

*وەیس: دەشتێکە لە قەراخ سلێمانی.

*یانەی مووچەخۆران: نادی موزەفەکان.

*دارە دارە: مەبەستی سەرخۆشی‌یە.

*فەیلەقورچ: مەبەستی فەیلەسوفە.

*چاریلکە: عەینەک.



## چیرۆك

# گردی شەهیدان

تازە هاتبوومە شارەکە. گەرمەی بەهار بو، سروشت بەبەرگی ڕەنگین ڕازابوەوە. منیش هەمو ئێوارەیەك بەپێ بەرەو ڕۆژهەڵاتی شارەکە ئەڕۆیشتم، دووا قۆناغم ئاشە ((سوور)) بو. لە سەر بانەکەی لەناو سەوزە گیای دەشتەکەیا دائەنیشتم، بەباڵی خەیاڵم ئەفڕیم بۆ دنیایەکی دوور ئێجگار دوور. ئەختێ لەم ئاشە دوورتر شاخە رووتەڵەیە لام وابێ لەبەر بێ دارو درەختی ئەم ناوەی لێ نراوە. لەنزیك بناری ئەو شاخە گردێك دیارە، چاو هانای ئەکا کە دەوران دەوری بەکۆمەڵە گڵ تەنراوە. بەم کۆمەڵە گڵانەدا گومان نامێنێ کەلەسەر دەمێکا لەسەر ئەم گردە چەند کەسێك خۆیان لەبۆسە داوە لە گەڵ هێزێکدا جەنگیون.

ڕۆژێك نزیك ئێوارە، لەسەر خوی جارانم بەرەو ڕۆژ هەڵات کەوتمە ڕێ، کاتێکم زانی ئاشە سورم بەجێ هێشتوە گەیشتومەتە بن گردەکە. لەدەم شاخەکەی تری ڕۆژ ئاوای شارەکە شەوە، ڕۆژ بەتارا ئاڵەکەی خۆی پێچابوەوە، ئامادە بو ماڵ ئاوایی لە شارەکە بکا تیشکە سوور بارەکەی لە گوڵاڵە سورەکانی پاڵ گردەکەدا شکابوەوە، ڕەنگێکی پرشنگداری بەو گوڵانە پەیدا کردبو. ئەم دیمەنە دڵ فرێنە هێنامیە سەر ئەوەی سەر گردەکە بکەوم، سەیری دیمەنی سروشت بکەم لەکاتی ڕۆژ ئاوا بونا.

سەر گردەکە گۆڕە پانێکی فراوان بوو، بەگیا کێویلە داپۆشرابوو. لەم لاو لەملا، لەناو گیاکانا تاشە بەردی درێژ بەرز بوبونەوە لەکێلی قەبر ئەچون. لەهەر چوار لاشیەوە وەکو چەپەر[1] گڵ هەڵچنرابوو. لەپەنایەکی ئەو تاشە بەردانەدا شتێکی ڕەشم بەدی کرد. کە لێی چوومە پێشەوە، ئەبینم پیرێژنێکە بە عەبایەکی ڕەش خۆی پێچاوەتەوە لەناو گیاکەدا دانیشتوە.

بەڵام لە ڕوخساریا شێوەی جوانێکی ڕابووردو دەردەکەوێ. بێ ئەوەی بترسێ یا بسڵەمێتەوە بە دەنگێکی نەرم وتی:

ئەزانم هاتووی چاوت زاخاو بدەیتەوە بەم دیمەنە جوانە.

ووتم: ڕاست ئەکەی دایە. ئەی تۆ بەم درەنگ وەختە لێرە چی ئەکەی؟.

لەوەڵامدا ووتی:

من؟، ئەمە پیشەمە. هەمو ڕۆژی هەینیەك ئەگەر تەڕوو توشی نەبێ، لەبەیانیەوە تا ئێوارە ئێرە جێگامە. یەمە سەر گۆڕی دلاوەری مێردم.

کە داپیرە ئەمەی ووت، لەدڵی خۆما ووتم ئەبی دلاوەر یەکێ بووبی لەو شۆڕ گێڕانەی لەناو ئەم چەپەرانەدا جەنگیون، وەئەبێ ئەم ئافرەتە پیرە باش لەم کارەساتە بزانێ. بۆیە بەرامبەری دانیشتمو لێم پرسی:

دایە دیارە ئێرە لەسەر دەمێکا کوڕی شەڕ بوە.

ووتی: بەڵێ شەڕ بەڵام چۆن شەڕێ، سەیرکە ئەوانە گۆڕی هەشت شەهیدە. ئەمەیان دەستی خستە سەرکێلەکە گۆڕی دلاوەری مێردمە. دەساڵ پێکەوە ژیایین، ئاخ، بۆ ئەو دەساڵە چەند خۆشوو پڕ کامەرانی بوو. خۆزگە، ئەم زانی (پۆلا) مان لەکوێیە، نازانم ماوە یا مردوە. ئەگەر مردبیش هەر گۆڕەکەیم بزانیایە، جارو بارە سەری ئەویشم ئەدا، بەمە قوڵپەی دڵم ئەختێك ئەنیشتەوە بەڵام ئاخ، کوا لەچی خاکێك نێژراوی دایە گیان پۆلا، کوڕتان بوو؟.

بەڵێ هەر ئەو تاقە کوڕمان بوو.

ئەویشمان برد، تازە لەکیسم چوو. بەداوێنی عەباکەی فرمێسکی سڕیەوەو بەهەنسکەوە هاتەوە قسە:

ئای کوێرایم دایە، ئێستاش ئەڵێی دوێنێیە شەوێك نزیك بەهار، لەماڵی ئێمە ئاهەنگی ((سەمەنی)) بوو. کچو کوڕ تێکەڵ بەیەك بو بوین شایی ڕەش بەڵەك بوو، منیش لە تافی جوانیما بووم، لەو ئاهەنگەدا، لەگەڵ دلاوەر دڵمان چوو بە یەکدا. بۆ بەیانی خوازبێنی کردمو بەیەك گەیشتین. پاش چەند ساڵێك خوا پۆلای داینێ بەمە ئێجگار ژیانمان بور بەبەهەشت، وامان ئەزانی دنیا تا ئەبڕێتەوە هەموی خۆشیو کامەرانیە.

هەناسەیەکی هەڵکێشا وەهەمدیسان بەداوێنی عەباکەی فرمێسکی سڕیەوەو بەدەنگێکی لەراوەوە دەستی کردەوە بەقسە: بەرە بەری پایز بو نیوەڕۆیەك لەگەڵ پۆلا دانیشتبووین. کە ئەوسا لەتەمەنی حەوت ساڵاندا بو. چاوەڕێی دلاوەرمان ئەکرد بێتەوە بۆ قاوەڵتی کاتێکم زانی دلاوەر بەپرتاو خۆی کرد بەژوورداو یەکسەر بەرەو گەنجینەکە ڕۆیشت کە هاتە دەرێ فیشەك ئەغی لە کەمەری بەستبو. تفەنگەکەی بەشانیەوە بو. بەمە ڕەنگم بو بە جاوی گازری، لەوە ئەترسام لە دەرەوە توشی شەڕو شۆڕ بووبێ بەڵام بەزەردەخەنەیەکەوە پێی ووتم:

گوڵنان، دوژمنە کۆنەکەی نەتەوەکەمان. دیسانەوە لەشکری نزیك کردۆتەوە لەسنوری شارەکەمان، دیارە نیازی خراپە پیشەوامان عێل جاری کردوە، ئەبێ هەمو چەك بەدەستێ ئامادەبێ بۆ پاراستنی نیشتمان لەدوژمن. ئاگات لە پۆلابێ ئیتر بەخواتان ئەسپێرم ئەمەی ووتو منو پۆلای ماچ کردو دەرپەڕیە دەرێ ئەو ڕۆیشتنە بوو ئیتر چاوم پێی نەکەوتەوە، هەناسە سارد خۆم. ئەختێك بێ دەنگ بو لەپاشا دەستی کێشا بەڕانی خۆیا ووتی:

تەقو توق کەوتە ناو شار پیاوەکانمان هەمو لەکۆڕی جەنگا بو لەشکری داگیر کەر هێرشی هێنایە ناو شار ئێمەیش کە ئافرەتو منداڵو پیر مابوینەوە هەر ئەوەندەمان پێکرا بەکوتەكو خڕکە بەردوپانی بەرز هەر تەپلە بەسەرێکمان بدیایە- لەشکری دوژمن هەمو تەپلەیان لەسەردابوو- لەناخافڵ پیامانا ئەپلۆستو بۆی دەرنەچوین.

هی‌وامان هەبو ئەکەوتە بەردەستیان، ئیتر نازانین چیان لێ ئەکرد. چونکە جارێکی کە چاومان پێی نەئەکەوتەوە. ڕۆژێك پۆلا لەبەر دەرگا ئەبێ وەکو دراوسێکان بۆیان گێڕامەوە دوو تەپلە بەسەر بەرەو پیری یەن. یەکێکیان بەزمانێ کەس ئەی ئەزانی ئەڵێن چی، قسەیەك ئەڵێ‌و بەوی تریانو پەلاماری ئەدەنو ئەیبەن.

ڕەنگە ئەویش وەکو خەڵکی بەردی پیا کێشابن. ئیتر نازانم چی بەسەر هات، ئاە ئەگەر ئاگام لێ ئەبو تا خوێنی خۆم ئەخستایە کاسە ئەم ئەهێشت دەست بەرن بۆ موویەکی سەری.

دەستی شکاوم، ئەگەر ئێستا بمایە لە هەرەتی سیوپێنج ساڵانەدا بوو.

داپیرە بەهەنسکی گریانەوە دەستی کرد بەباخەڵی کەواکەیاو پڕیاسکەیەکی بچووکی سوری دەرهێناو ووتی:

ئەمە پیاوێکی شەل پاش بڕانەوەی جەنگەکە بۆی هێنامەوە پێی ووتم: دلاوەر لەسەر گردەکەی لای شاخە ڕووتەڵە نێژراوە وە بۆ نیشانە دارێك لەسەر گۆڕەکەی چەقاوە.

لەمەزیاتر کابرا ورتەی لەدەم دەرنەهاتو پەجێ‌ی هێشتم. هانێ چاوێکی پیا بخشێنە.

کە پڕیاسکەکەم کردەوە، پارچە قاقەزێکی بچوکی زەرد باوی تیا بوو، بە خەتێکی ناخۆش ئەمەی تیا نوسرابوو:

خۆشەویستەکەم پۆلا:

هەر چەندە گومانم هەیە لەمانت، چونکە دوژمن بڵاوی کردەوە، لە ماوەی ٢٤ سەعاتا هەر شۆڕش گێڕێ خۆی نەدا بەدەستەوە، هەر چی خێزانی هەیە ئەنرێ بە تفەنگەوە. وە ئەشزانم دوژمنەکەمان ئێجار دڕندەیە، هەمو شتێکی لە دەست دێت. هەروەها دوریش نیە هەڵگری ئەم نامەیە ئەکوژرێ وە لەگەڵ خۆیا ئەی باتە خاکەوە. بەڵام وەکو شتێ بەپێویستی ئەزانم لەم کاتی سەرەمەرگە نامەیەکت



هەر بۆ بنێرم هەر بۆ تۆی نانێرم بەتەنیا بۆ هەموو ڕۆڵەکانی دوا ڕۆژی ئەنێرم.

ڕۆڵە گیان:

ئێستا ئەمە دەمەی نیوەڕۆیە، ڕەنگێکی خۆڵەمێشی کشاوە بەبەر ئاسمانا تار تار بەهێز ئەبێ و گەردەلوول پێچ ئەخوا، لەچەپەرە کەما، لە تەنیشت ئەریمانی هاوڕێمەوە ڕاکشاووم هەردوو دەستو لاقم گوللە بردویەتی من قسە ئەکەم و ئەریمان ئەینوسێ.

ڕەحمەتی دەروونم لە ئازاری لەشمی زۆر کەم کردۆتەوە، چونکە ئەوەی لەدەستم هات لە پێناوی گەلو نیشتمانا کردم. ئەگەر ئەم ڕەحمەتی دەروونە نەبوایە باوەڕت بێ ئەم ئەتوانی خۆم لەبەر ئەم ئێشو ئازارە بگرمەوە ئەم نامەیە بۆ تۆ بەهاوڕێکەم پڕ بکەمەوە ئێستا ئەریمان ئەختێك ڕاوەستا دوو تەپلە بەسەری گلۆر کردەوە.

بەڕاستی بەخیلی پێ ئەبەم، خۆزگە منیش وەکو ئەو هەر دەستێکم لە گل ئەکەوتایە

نازانم ئەنجامی ئەم شەڕە چۆن ئەبێ هەرچی چۆنێ بێ سەرکەوتن هەر بۆ ئێمەیە ئێمە ڕەنگە یەکێکمان دەرنەچین. بەڵام ئەی ئێوە چین، ئەی ئەتەوەکەمان چیە با بەهەزاران لەناو بچین، وەچەمان هەر ئەمێنێ تۆڵەی باوو باپیرمان بکەنەوە. بۆیە وائێستا بەدڵنیاییو کامەرانی چاو ئەنێمە سەر یەك.

تۆو دایکتم ڕۆحی شیرینم ڕۆڵە ئیتر وا زمانم خەریکە.. بشکێ.. بژی..

باوکت

دلاوەر

٦/ئەیلول/١٩٣٠

تا ئەخوێندنەوەی بوومەوە فرمێسك بەرچاوی گرتبووم. وەکو خۆی پێچامەوە سەرم هەڵبڕی بیدەمەوە دەستی، ئەبینم ئافرەتەکە زۆر بەوردی سەرنجم ئەداتێ. پاش ئەوەی پڕیاسکەکەی خستەوە باخەڵی ووتی:

قسەکانت ئەختێ لەهی ئەم شارە ناچێ لەکوێوە هاتوی؟.

ووتم:

-ئەمە چەند ڕۆژێکە لەو دیو لەشاری (س)وە لەگەڵ باوکما هاتوم ووتی:

-لەو جێگا دوورەوە ئەی لەکوێ دابەزیبون.

-لە ئوتێل

-لەگەڵ خۆتا نام بەی بۆ لای باوکت، ئەختێ ئیشم پێ‌ی هەیە؟.

لەم داخوازیە سەرم سوڕما، باوکێکی ئەدیو ئەناسیو ئەبێ ئەم داپیرەیە ئیشی چی پێ‌ی هەبێ. زۆرم بەزەیی پیا ئەهاتەوە لەدڵی خۆما ووتم، ڕەنگە داوای پارەی لێ بکا، هەرچی چۆنێ بێ، زیان نابەخشێ با لە گەڵ خۆما بیبەم.

دنیا تەواو تاریك بوبو کە خۆمان کرد بەژووری ئوتێلەکەدا.

باوکم لەسەر قەرەوێڵەکە بە پاڵ کەوتنەوە ڕۆژنامەیەکی ئەخوێندەوە کە هەستی بەترپەی پێ کرد سەری هەڵبڕی ووتی:

-عارف

کە چاوی بەپیرێژنەکە کەوت لە پشتمەوە، قسەی پێ تەواو نەکرا، لێوی نایەوە سە لچی. تا ماوەیەك لەهاتنی ئەم پیرێژنە ئەناسراوە، بەم



شێوەیە وە بەتایبەتی لەگەڵ منا بو ئوتێل، واقی وڕما.

بەڵام من ئەم هێشت واق وڕمانەکەی درێژە بکێشێ گورج ووتم:

-بابە لەسەر گردێ لەقەراخ ئەم شارە چاووم بەم داپیرەیە کەوت وەلە سەر داخوازی خۆی هێناومە بۆلات نازانم ئیشی چی پێتە.

باوکم ڕاست بوەوەو ڕۆژنامەکەی خستە ئەولاو وەبەسەر سامیەکەوە سەیری داپیرەکەی کردو ووتی:

-ئیشی بە من فەرموو دانیشە.

بەخێر بێ‌ی

-بەڵی ئیشم بە تۆ هەیە. ئافرەتەکە وەڵامی دایەوە. باوکم پێی ووت.

-فەرموو خوشکم ئامادەم بۆ هەمو یارمەتیەك

-یارمەتی پارەو مارە نیە، هەر ئەوەندە ئەبێت چەند پرسیارێکت لێ ئەکەم، بەڵام تووو ئەو خوایەی ئەی پەرستی ئەگەر بەڕاستی وەڵامم ئەدەیتەوە.

هەر زیانی تیا ئەبێ وەڵامت ئەدەمەوە.

-هیچ زیانێکی تیا نیە. بەڵام ئارەزوو ئەکەم هەردوکمان بەتەنیا بین.

بێ ئەوەی باوکم پێم بڵێ چومە دەرەوە لە هەیوانی ئوتێلەکە دانیشتم.

پاش سەعاتێك باوکم بانگی کردمەوە ژوورەوەو خۆی دەرگای ژوورەکەی داخست. پیرێژن هەر کە چاوی پێم کەوت پەلاماری دامو کەوتە هەڵمژین و ماچ کردنم، وە بە خوڕیش فرمێسك بە چاویا ئەهاتە خوارێ. هەر ماچی ئەکردمو ئەی ووت: ئۆخەی ڕۆڵا گیان.. ئۆخەی ڕۆڵاگیان.. ئەوە تۆی بەساقەت بم ئەترسم خەوبێ نانا خەو نیە ئەوەتای لەبەر دەمما ڕاوەستاوی بەقوربانی بەژنو باڵات بم. جار جاریش پەلاماری دەستی باوکمی ئەداو ماچی ئەکرد دەستی بەرز ئەکردەوە بۆ ئاسمان نزای خێری بۆ ئەکرد.

لەمە تاس بردبومیەوە، لەدڵی خۆما ووتم وا بەسەرمانا شێت بو، سەیرکە چیم کرد بەخۆم، بۆ هێنام بۆ ئێرە ئێستا خەڵکی ئوتێلەکە بەسەرمانا دائەبارێ. لەتاو سەرسامی دەمم بووبە تەڵەی تەقیو، لەپاشا باوکم هەڵسار پیرێژنی لەبەرۆك کردمەوە لەسەر خۆ لەولاوە داینار ووتی:

-بەسە پورێ ئەختێ خۆت بگرە، باخەڵکی ئوتێلەکە لێمان ئەهورژێن. تازە بەمرازی خۆت گەیشتیت.

لەپاشا باوکم ڕوی کردە منو بە هێواشی ووتی:-

-ڕۆڵە عارف، ئەم داپیرە دایکتە، دایکی ڕاستەقینە، ئەمن باوکتم ئەخەرامان دایکتە. تۆ کوڕی ئەو دلاوەرەی کە ئەم ئێوارەیە لەسەر گردی شەهیدان نامەکەیت ئەخوێندەوە منداڵ بوی. بەدەست دوو تەپلە بەسەرەوە بەزاکو زووك ڕایان ئەکێشای، منو هاوڕێیەکەم بەڕێ کەوت بەلاتانا تێ پەڕین، بە قسەکانیانا تێ گەیشتین نیازیان خراپە لەگەڵت. لەناخاڵ هەردوو تەپلە بەسەرەکەمان دایە بەر خەنجەر، تۆمان ڕزگار کرد، وەتا شەو داهات لە ماڵێکی ئاشنای خۆمان شاردمانیتەوە. شەوێ بە

پیاوێکی دڵسۆزی خۆما ڕەوانەی شارەکەی خۆمانم کردی. منیش پاش ئەوەی ئیشی. خۆم تەواو کرد گەڕامەوە. بەڵام تۆ زۆر پەرێشان بوی، خەرامان بەدیارتەوە هەر دەگریا ئاگات لەخۆت نەبو ورێنەت ئەکرد. پزیشکیمان هێنایە سەرت وتی کارێکی سامناك کاری لە دەماری کردەوە، چاك بونەوەی لەگوماندایە.

بەڵام لەئەنجامدا پاش مانگێك چاك بویتەوە هەر ئەوەندە ئەبێ شتی ڕابوردوت لەبیر نەمابوو تەنانەت ناوی خۆشت لەبیر چوبوەوە، منیش ناوم نای (مارف)وە بە بەرژەوەندیشمان ئەزانی هیچ باسێکی ڕابوردووت بۆ بگێڕینەوە، چونکە گێڕانەوەی ڕابوردووت لەدڵ ئازاری بەولاوە هیچ سوودێکی تری بۆ تۆ تیا نەئەبوو. بەڕاستی من و خەرامان زۆر دڵشاد بوین بەتۆ، بە تایبەتی کە وەجاخ کوێرین خوا لەمناڵ بێبەشی کردوین.

دایکم هەڵی دایە:

-ئەی بۆ ژنێکی ترت نەهێنا، بەشکم خوا لەو منداڵێکی بدایتایە، وتی:

-ژنێکی ترم بەسەر خەرامان هێنا تا چوار ساڵ لام بو لەویش هیچم نەبو وە لەبەر ئەوەی لەگەڵ خەرامانددا ئاکۆك بوون تەڵاقم دا، کە شوی کردەوە بەیەکێکی تر کەوتە زاوزێ ئەمە پێی سەلماندم کە خۆم وەجاخ کوێرم، خەتا لە ئافرەتەوە نیە.

پاش ئەم قسانە، مێشکم وەکو تەزبیێو تازە بەری بدا شێوەی کارەساتێکی پڕ تەموو مژی پیا ڕۆی وەکو چەند دەمو چاوێکی مرو موچو تەپلە بەسەریانەوە هیچی تر، لەپڕ چاوم پڕ بوو لەفرمێسکو دەستم کردە ملی دایکم تێر ماچم کرد. لەپاشا لێم پرسی..

-لەسەر گردی شەهیدان هیچ هەستێکت ئەکرد من کوڕی تۆ بم؟

دایکم بەزەردەخەنەیەکەوە وتی:

-یەك نیشانەم لە ڕوومەتی چەپتا بەدی کرد، ئەوە منی خستە گومانەوە. دەستی خستە سەر پەڵەکەی ڕوومەتی چەپموو هاتەوە قسە:

-ئەم نیشانەیە زگماکە، کە لەدایك بوی بە ڕوومەتتەوە بوو، مامانەکە ئەی وت، ئەمە نیشانەی مشایەخە، ڕاستیش ئەکا کەتۆ لەزگما بوی چووبومە سەر (شەخە پیرە). ئەی ئازانی لەسەر گردی شەهیدان کە قاقەزەکەت ئەخوێندەوە بۆچی هەر سەیری ڕوومەتتم ئەکرد. بەڵام ئەم نیشانەیە بەس نەبو دڵنیام بکا. بۆیە ئەمویست کاك بەکری باوکت ببینم وەچەند پرسیارێکی لێ بکەم. پاش تۆزێك بی دەنگ بون کاك بەکر پەتی بێ دەنگی پچڕی و وتی:

-گوڵنار: هەروەکو پێم وتی من وەجاخ کوێرم، وەتازە ئەمنو ئەخەرامان بێ پۆڵا هەڵ ناکەین، ئەیەڵی ئێمەیش لێرە لەگەڵ ئێوەدا بژین؟.

دایکم وتی:

-ئەتان خەمە سەر هەردوو چاووم، خۆشم خەریك بووم ئێستا ئەم داخوازیەتان لێ بکەم.

-باشە بەیانی ئەنێرم بەشوێن خەرامانا، کاك بەکر وەڵامی دایەوە.

ئێستا هەموو ڕۆژێکی هەینی خەڵکی چاویان بەچوار کەس ئەکەوێ، دوو پیرێژن و پیرە مێردێك و پیاوێکی هێشتا گەنج، گەنجەکە تورەکەیەکی لەبن هەنگڵ دایەو سەتڵێکی بەدەستەوەیە بەرەو گردی شەهیدان ئەڕۆن، لەوێ حەڵوای گەزۆو کولێرەو خواردەمەنی تر لە تورەکەکە دەر ئەهێننو ئەیبەخشنەوە بەسەر منداڵانا کە ئەمانیش فێر بوون هەموو ڕۆژی هەینیەك سەر لەو گردە بدەن بۆ وەرگرتنی بەشە حەڵوای خۆیان وە سەیری ئەو چوار کەسە بکەن کە بە سەتڵ گوڵە دەست نێژەکانی خۆیان لەسەر گۆڕی شەهیدەکان ئاو ئەدەن.

ئەو چوار کەسە، من و کاك بەکرو دایکم و خەرامانە. نامەکەی باوکیشم لە شوشە گرتوەو لە ژوورەکەی خۆما لە ژوور سەرمەوە هەڵم واسیوە.

## چیرۆك

# ئاوگیران

ئاخ ئاخ ئازانم دنیا بۆ واگۆڕاوە ئەخۆر ڕەنگە جوان و گەرمەکەی ماوە.. ئەمانگ تریفەی جارانی هەیە.. ئەئەستێرەکان ئەدرەوشێنەوە ڕوخساری دانیشتوانی گوندەکەشم گۆڕاوە.. ماتو مەلوولی یان تێدا بەدی دەکەم.. ئۆف .. ئۆف.. ئەم دنیایە بۆ وای لێهات.. ئەوە چییە.. بەم بەیانی زوو وە حیلەی ئەسپ دێتە بەرگوێم.. وا لە دەرگاش درا.. ها.. جەمشید.. ئەوە تۆی.. ماندوو نەبیت.. لەبەر دەرگا ئەسپەکەت ببەستەرەوە.. فەرموو وەرە ژوورەوە.. با لە سەر ئەم سەکۆیە دانیشین..

: ئەوە بۆ وا وازو بێ تووك بوی فەرەیدوون.. بەڵێ.. بەڵێ.. ئەزانم .. ئەزانم.. جگەرت بە چ تیرێك پێکاوە..

: بەڵێ دەزانی.. مانگێك لەمەوپێش هاتم بۆ گوندەکەتان، چووم بۆ ماڵی ئەفراسیاوی خزمم..داوای چیمەنی کچیم کرد ببێ بەهاوسەرم.. خۆت دەزانی، دەمێکە دڵمان چووە بەیەکدا.. بەڵام ئەفراسیاو، هات بەگژ مندار قسەی ناشیرینی پێ وتم.. ئەگەر باوکی چیمەن نەبوایە بەخەنجەر سەرم دەبڕی.. هەر ئەو شەوە سەری خۆم هەڵگرتو گەڕامەوە گوندەکەی خۆم.. لەوساوە ئارامم نەماوە.. ئازانم بۆ ئەفراسیاوی خزمم ئەمەی پێ کردم.. هەردوکمان لەیەك بنەماڵەین، ئەگەر چی سامانم لەو کەمترە، بەڵام لە ئازایەتی و، سوار چاکی و، پیاو چاکیدا، زۆر باوم بەسەر ئەودا هەیە..

:کاك فەرەیدون..گوێی مەدەرێ.. تەنگانە هەتا سەر، بۆ کەس نی یە.. ئەوە بۆڵێم ئا پرسی، بەم بەیانی یە بۆ گەیشتویتە ئێرە.

-:بەخوا ڕاست دەکەی.. هەر کە لە ئەسپەکەت دابەزیت، خەریك بووم ئەم پرسیارەت لێ بکەم.. بەڵام، قسە بەسەر قسەدا هات و لەبیرم چووەوە.. فەرموو.. ئەمرێك.. کارێك.. ئەوە دەست دەکەی بەباخەڵتا.. دیارە .. نامەیەکت.. نامەیەکت.. لەچیمەنەوە.. بۆ هێناوم..

-: فەرموو بیخوێنەرەوە.. ئەوا ئاوێکی زوڵاڵ، لە کانیاوی دامێنی ئاوچەوانتەوە، بەگۆناتا هاتە خوارێ.. ها بەم دەستە سڕە ڕێچکەی بگرە با لەپلووسکەکەوە نەڕژێتە ئاو هەناوت..

-: جەمشید گیان.. لێم گەڕێ.. دەردی خۆم کەمە، وا ئەمەشی هاتە سەر.. بۆی نووسیوم، دێوێك بەری ئاوی لێ گرتوون..

-: بەڵێ.. چەند ڕۆژێك لەمەوپێش تاکاتێکمان زانی جۆگەکەمان ئاوی پیا نایەت.. یەکێك چوو بۆسەرچاوەکە تا بزانێ ئاوەکە بۆ بڕاوە.. بینی دێوێك، بەری ئاوەکەی گرتووە.. هەر کە چاوی بەپیاوەکە کەوت، ئەڕاندی بەسەریاو پێی وت ((هەفتەی جارێك، لاوێکی گوندە کەتانم بۆ بهێنن خوێنەکەی بمژم، ئاوتان بۆ بەردەدەمەوە)).. ئەمە لە سەر کاری گوندەکەمان گەیەندرا.. ئەویش لاوە بەهێزە ئازاکانی گوندەکەی نارده سەر دێوەکە بیکوژن.. بەڵام لەشی دێوەکە، وەکو لە پۆڵا دروست کرابێ، هیچ چەکێ کاری لێ نەکرد.. ئەویش چەند لاوێکی بەردەست کەوت و، تێکی شکاندن و، خوێنی مژین خەڵکی دێ یەکە، هەموو ڕەش پۆش و لێو بەبارن.. ئەم بەڵایە بەسەر ئێمەدا هاتووە، بەسەر کەس نەهاتووە..

-: کاکی خۆم جەمشید.. خۆت ئەزانی، جارو بار دێوەکان، بۆ مژینی خوێن، سەر لەوڵاتی ئێمە دەدەن.. بەڵام لەبەر پەلاماری جەماوەردا خۆیان پێ



ناگیرێ. دەیان کوژن، یاڕادەکەن.. دەبێ ئەم دێوەی لای ئێوە چ دێوێك بێ‌کە ئەو هەموو لاوە ئازایانە، نەیان توانیوە بیبەزێنن.

-: وەکو پێم گوتی، لەشێکی پۆلاییینی پێوەیە.. هیچ چەکێ کاری لێ ناکات

-: ئەمە قسەی پووچەو، ناچێتە گیرفانەوە، دەبێ هێزێکی تر لە پەناوە یارمەتی بدا کە، ئێوە دەرکی پێ ناکەن.. هەستە، بابڕۆین بۆ گوندەکەتان با منیش گورزی خۆم بوەشێنم.. لای من مردن لەپێناوی خۆش گوزەرانی خەڵکیدا، زۆر لە ژیان خۆشترە.. بەتایبەتی لە ژیانی یەکێکی وەکو من..

***

-: جەمشید.. بادابەزین.. کەمێك لەسەر ئەم گردە کە، بەسەر گوندەکەتاندا دەڕوانێ، ڕاوەستین چەند پرسیارێکی ترم بیرکەوتەوە لێتی بکەم..

-: باشە..

-:سەیرکە.. ئەم گوندە جوانە، پڕ لە گوڵ و گوڵزارە، ڕەنگو بۆی پێ نەماوە، گەڵای درەختەکان، دەڵێی لە خەزاندان بەزەردی دەخزێنە خوارەوە، گوڵە ژاڵەو نەرخەوان و نێرگزو هێرۆو شلێر، ژاکاون و بەرەو سیس بوون دەڕۆن، باڵندە بەئاسمانەوە نی‌یە.. ئاخ چیمەن گیان.. چاوم لە ماڵەکەتانە.. نەبێ ئێستا دەروونت چۆن جۆشی خواردبێ. .

-: بەسە فەرەیدون.. هەر لەبەر خۆتەوە قسە دەکەی .. دەپرسیارەکانت بکەو بڕۆ.. خوا نەکا لەم بەڵایە ڕزگارمان نەبێ، ئەوەندەی پێ ناچێ گوندەکەمان، دەچێتەوە تافی جوانی‌یەکەی جارانی..

-: سەرچاوەی ئاوەکە لەکوێ‌یە؟

-: ئەوەتا لە بناری ئەو کێوە.. سەیرکە دێوەکە ئەڵێی گردە بۆرە لە بەریدا پەپکەی خواردووە.

-: لەناوەڕاستی کێوەکەدا کونێکی ڕەش دیارە، ئەشکەوت نی‌یە؟

-: بەڵێ ئەشکەوتە.. قاوەیەکە پیرەمێردێکی کۆماوەی ڕیش درێژی سپی تیایا جێ نشین بووە.. شەوو ڕۆژ خەریکی زکرو تەهلیلەیە.. ناو بەناو، دێ بۆ ناوگوندەکە بۆ ئەوەی خەڵکی خێری پێ بکەن.

-: ئەم سۆفیە، پێش هاتنی دێوەکە، یا پاش هاتنی لەم ئەشکەوتەدا نیشتەجێ بووە!

-: پێش هاتنی دێوەکە بەدووسێ ڕۆژ.

-: دیارە تۆش لەگەڵ لاوەکاندا چوویتە سەر دێوەکە، سەیری کۆێی دەکرد.



-: هەر سەیری ئەشکەوتەکەی دەکرد.. هانەو زەردەخەنەیە چی بوو بەسەرلێوتەوە نیشتەوەو بەپەلە ڕۆی..

-: هیچ نی‌یە ڕێبوارێکە.. تۆ بەرەو خوار بەرەوە تا لە دێوەکە نزیك دەبیتەوە.. بەڵام نەیەڵی پێت بزانێ..لەپەنایەکدا خۆت بشارەوە.. منیش بەرەو ئەشکەوتەکە دەڕۆم.. کە گوێت لەتەقەو چاوت لە دووکەڵ بوو، لە ئەشکەوتەکە یەتەدەرێ.. دێوە دەبۆڕێنێ، تۆش دەست بەجێ گوللە بارانی بکە.. مەترسە.. گوللە دای دەبێژێ.. ئەوسا لەلای لاشەی دێوەکە بەیەك دەگەینەوە..

-: بەراستی سەرم لەم کارەی تۆ دەرناچێ.. چوونی من بۆلای دێوەکە.. چوونی تۆ بۆ ئەشکەوتەکە.. تەقەو دووکەڵ.. کارکردنی گووللە لە دێوەکە.. ئەمە چی بەسەر چی‌یەوە هەیە.

-: لەدواییدا مەسەلەکەت تێ دەگەیەنم.. جارێ خوات لەگەڵ..

-: ئەمە پەنایەکی باشە دێوەکە دەرکم پێ ناکات ..

ئەوە تەقە دەنگی دایەوە..ئەوە دووکەڵ بڵاو بووەوە.. ئەها بۆرە لەدێو هەڵسا واخەریکە بەرز دەبێتەوە.. دەی.. دەست لەدەست و هێز لەخوا.. ئەوا گوللە پێکاندی.. کەوت.. لە لەنگە فرتێ کەوت.. ئای خوێناو بڵاو بۆوەو.. ئۆخەی ئەوە دەنگی هاژەی ئاوە بەرێوتەوە.. وا خەڵکی بەسەرمدا دابارین.. هەڵپەڕین و ڕەش بەڵەکە.. چەپڵە ڕێزان و گۆرانی‌یە.. دەست مەکەنە گەردنم .. ماچم مەکەن.. ئەمە ئازایەتی من نی‌یە.. یەکێکی تر ڕزگاری کردوون.. سەیرکەن .. وا لە شاخەکەوە بەسواری ئەسپە کوێتیەکەی بەغار دێت بۆلاتان.. ئەوا گەیشت ..

-: خۆ منداڵ نیم بەباوەش دام بەزێنن.. خۆم دائەبەزم.. ئەسپەکەم بەرن بەو لاوە.. بەسە دەست لەملان و ماچکردنم.. گوێم لێ بگرن با لە نهێنی بەپۆلا بوونی ئەم دێوە تێیبوەتان حاڵی بکەم.. کە کاك جەمشید هات بۆ لام بۆی گێڕامەوە تووشی دێوێك بووین هیچ چەکێك کاری لێ ناکا، سەرم سوڕما.. وە بۆ ئەوەی بەباشی لەم دێوە لە عەقڵ بەدەرە بگەم، لەگەڵ جەمشید هاتم بۆ گوندەکەتان.. ئەختێك لەسەر ئەو گردە ڕاوەستاین، لەو ئەشکەوتەی دەکەوێتە سەر دوو سەرچاوەکەتانەوە هەروەکو کاك جەمشید بۆی گێڕامەوە سۆفیەك دەژیا، ئەم دێوەش هەر سەیری ئەشکەوتەکەی دەکرد.. ئەمە سەرنجی ڕاکێشام.. بۆم ڕوون بووە کە تەلیسمی ئەم سۆفی‌یە درۆزنەیە، لەشی دێوەکە

بووە بەپۆلا.. لە كتێبەكانی باوكمدا، لەم جادوو گەرانەم زۆر خوێندۆتەوە.. جەمشیدم نارد لە نزیك دێوەكەوە خۆی بشارێتەوە.. كەی گوێی لەتەقەو چاوی لەدووكەڵ بوو.. دێوەكە گوللە باران بكا.. منیش بێ خشپە خۆم كرد بە ئەشكەوتەكەدا، بینیم پیرە مێرد، سەری بەسەر خەرەكێكدا شۆڕ كردۆتەوە، خەرەك دەڕێسێ.. خەریك بوو سەر هەڵبڕێ، بەلام دەرفەتم نەدا.. دامەبەر گوللە.. خەرەكەكەشم پارچە پارچە كرد، ئەو بوو بەچەرە دووكەڵێك چاو چاوی نەدەدی.. لەو خەرەكەوە تیشكێكی نەبینراو دەردەچوو، دەی داڵە دێوەكەتا، لەشی دەكرد بەپۆلا.. وەك پیرەمێرد كوژراو خەرەك شكا، تەلیسم بەتاڵ بووەوەو قاوغە پۆلاینەكەش لەلەشی دێوەكە بووەوە.. بۆیە گوللەی تفەنگەكەی جەمشید بەئاسانی پێكاندی.. مرۆڤ هەر تەنها بە ئازایەتی سەر ناكەوێ بەسەر دوژمنانیدا بەڵكو بیركردنەوەشی دەوێ.. لێرەدا ئەوەش دەبێ بڵێم كە، جەمشیدی هاوڕێم لە لەناو بردنی ئەم دێوەدا ئەویش گورزی خۆی وەشاند..

-: من سەر كاری ئەم گوندەم.. بەناوی خۆمو هەموو دانیشتوانی ئەم گوندەوە زۆر سپاستان دەكەین و، لە چاكەتان قەت دەرناچین.. ع پاداشتێكت دەوێ، ئامادەین پێشكەشتی بكەین.

-: من بۆ هیچ پاداشتێك، ئەم كارەم نەكردووە.. پاداشتی من رزگاربوونی ئەم خەڵكەیە لەم بەلایە.. ئا .. ئەوە مام ئەفراسیاو.. وەرە پێشەوە.. وەرە پێشەوە.. قەیدی ناكا، هەرچیت كرد بەرامبەرم لەم كاتەدا لەدڵمدا نەماوە.. پاداشتێكم لەتۆ دەوێ كە لەوەو پێش لەسەری دڵبریندارت كردم..

-: ئەی خزمی خۆشەویستم.. ئەوسا من بەهەڵەدا چووم.. وا لە سەر دەستی ئەم خەڵكەدا، چیمەنم پێشكەش كردی.. لەخوا داوا دەكەم هەموو ژیانتان بەهاری رەنگین بێ.

-: گیانەكەم فەرمیدون.. ئێستا دنیا چۆنە لەبەر چاوت.. رەنگی خۆر.. تریفەی مانگەشەو.. درەوشانەوەی ئەستێرەكان.. روخساری خەڵكی..

-: ئۆجەمشید گیان.. تیشكی خۆر بێ گەردو جوانە.. تریفەی مانگەشەو، زۆر دڵ رفێنە.. درەوشانەوەی ئەستێرەكان، مانای كامەرانیم پێ دەبەخشن.. روخساری خەڵكیش زۆر گەشە.

-: بزانە.. هەشت سەعات لەمەوپێش چۆن دنیات دەهاتە پێش چاو.. ئێستاش چۆنی دەبینی.. دنیا هەر وەكو خۆیەتی.. بەلام لە دەروونی ئێمەدا دەگۆڕێت.. ئیتر خوات لەگەڵ.

سەرنج: بۆ یەكەم جارە بلاودەبێتەوە.

بۆ ئەم چیرۆكە، سوودم لە ئەفسانەیەكی كوردی وەرگرتووە.

## چیرۆك

# ئادەمیزاد

ئەو ئێوارەیەی یەكی چوار دینارو نیومان خستە تەنكەی باخەڵمان كرێی پانزە رۆژ ئیش كردنمان لەكارگەكەی بارام بەگ لە خۆشیدا پێمان لەزەوی نەئەكەوت ئەوڕۆژە سەرمایەك بوو چوقە چوقی بە دانی خەڵكی ئەخست وە پەڵە هەورێكی رەشیش دنیای تاریك كرد بوو كەچی من و پەتیارە خۆشی دەروونی گەرم كردبووینەوە وەدنیاشی لێ رووناك كردبووینەوە ناحەقمان نەبوو چونكە پاش تەواو كردنی سەربازیەتی كە گەڕاینەوە شارەكەمان تا ماوەیەكی دوورو درێژ تامی ئەبوونی و بێپارەییمان چێشت لەدواییدا باش بوو خوا دەرووی لێ كردینەوەو لە كارگەكەی بارام بەگ یەكی رۆژی بە (٣٠٠) فلس بەشاگرد دامەزراین.

ئاسیاویمان ئەگەڕێتەوە بۆسەر دەمێك كە هەردوكمان سەرباز بووین لەشاری (عەمارە)وە لەیەك قاوشدا ئەنووستین. ناوی ئەوڕەحمان بوو، بەلام لەبەر ئەوەی هەڵەشەو بزێو بوو چەنەبازو بێ پەروابوو بە (پەتیارە) ناوی بلاو بوەوە، وە ئەوی راستی بێ رەوشتی سەیری هەبوو، بە نوكتەو قسەی سەیر هیچ پێكەنینی ئەنەهات بەلام لەپڕ وە بەبێ هۆ پێكەنین ئەیگرت ئەم رەوشتانەی گەڵێ كێشەی بۆ پەیدا ئەكرد شەوێكیان لەقاوشەكەدا لەگەڵ دووسەربازی تردا دانیشتبووین بەدەمە تەقێوە خۆمان خەریك كردبوو، لەكاتێكدا یەكێكیان لەگەرمەی قسەكردندا بوو، پەتیارە پێكەنینەكە گرتی، ئەویش قسەكەی بڕی سوور هەڵ گەڕا بەلام پێكەنینی پەتیارە نەگیرسایەوە، كاتێكمان زانی سەربازەكە دەمانچەی لێ هەڵ كێشا ئەگەر دەمو دەست فریای نەكەوتینایە پەتیارە لە خوێنی خۆیدا ئەگەوزا، هەروەهاش لەكاتی مەشقدا لەسەر ئەم خووەی دەمێك بە بەند كردن و دەمێكیش بەهەڕا كردن سزا ئەدرا. رۆژێ بە بازاڕدا ئەگەڕام ئەفسەرێك بەرەو رووم هات، منیش خۆم قیت كردەوەو لەبەردەمیا هەردوو قاچم دابەیەكداو تەمەنایەكم بۆ كرد، ئەویش دایە قاقای پێكەنین كەڵی وورد بوومەوە كاك پەتیارەیە توورەمز ئەفسەرەكەمان بەرگەكەی خۆی داوەتێ بیبا بۆ لای توتو چی ئەویش لەبەری كردووەو فیزی پێوە ئەكات، لەداخا پێم ووت :

-:هەی ئەگبەت ئەوە چیت كردووە. بەبێ پەروایی شانێكی هەڵ تەكاندو ووتی:

-:چیم كردووە؟ .. بۆ ئەوسالی دوانزە مانگ بەم بەرگەوە ئەگەڕێ هیچی نەكردووە، من ئەگەر لەسالان رۆژێك پێوەی بگەڕێم چیم كردووە؟ ماوەی مقۆ مقۆ نەبوو، رام كێشایە پەنایەكەوە بەرگەكەم لەبەر داماڵی، باش بوو زوو فریای كەوتم، ئەگینا سزایەكی توندی ئەخوارد.

ئێوارە كە ئیشمان تەواو بوو بەگیرفانی پڕ لەپارەوە لە كارگەكە هاتینە دەری و پەتیارە قۆڵی كرد بەقۆڵما (ئحم)ێكی كرد خووی وابوو ئەگەر شتێكی لەدلابوایەو ئەی ویرایە بیدركێنێ (ئحم)ێكی بۆ ئەكرد بۆیە پێم ووت:

-:دەی چیت لە دلایە بیلێ؟

-:ئیمشەو ئاوزگی خۆمان بەخواردنەوە یەك ئەبرژێنینەوە؟

-:ئافەریم پەتیارە ئەم پێش ئیارەت لەجێگای خۆیایەتی، هەستە بابچین بۆ مەیخانەكەی مەرقوس. لەسوچێكی مەیخانەكەدا لەدەوری مێزێك دانیشتین و دەستمان كرد بەدەمە تەقێ و گێڕانەوەی باسی رابووردومان بەدەم خواردنەوەوە لەپاشا كەباس هاتە سەر باسی كارگەكەمان پەتیارە وتی:

-: بەخوا وەستا حەمۆل كابرایەكی خراپە ئاگات لێ بوو دوێنێ تۆزێك دەستم لەمێش هەڵگرت بۆ ئەوەی جامانەكەم بپێچمەوە سەرم چۆن ئەڕاندی بەسەرمابەخوا ئەوەندەی ئەمابوو بكێشم بەپەنا گوێ‌یدا.

-:پەتیارەی ئاموبارەك لێرەش كێشەمان بۆ دروست مەكە خۆت ئەزانی وەستا حەمۆل سەركارو جێگای متمانەی بارام بەگە بەرەنگاری ببی ئان براو نەبی.

-:تۆ ئەزانی وەستا حەمۆل خەزووری بارام بەگە ئەم بارام بەگە ووركتە ژنەكەی خۆی پاش شەش سك تەلاق داوە كچی ئەم وەستا حەمۆلەی هێناوە كە تەمەنی لەهەژدە سال تێپەر نابێ.. وەكو ئەلێن زۆر شۆخ و نازدارە.. زۆر زاڵیشە بەسەر بارام بەگدا جارو پارە بەسۆلەكانی سەرو گوێلاكی ئەكوتێتەوە ئەلێن لوتیش بەمێردەكەیا ناهێنێ.



-:بەسە پەتیارە دارو دیوار گوێی هەیە  ئازانم کوێرا بەم پانزە ڕۆژە چویتە بنج و بناوانی بارام بەگ؟

بەڵێ ئەمزانی چرپە چرپت لەگەڵ شاگردەکانی تردا لەحەوشەی کارگەدا لەکاتی حەسانەوەدا لەخۆڕایی نیە.

بەخوا وەستا حەمزل گوێیەکی هەزار گوێیەو چاوێکی هەزار چاوو وریایە.

-: پێویستە پیاو ئەگەر لەجێگەیەکدا بێ بزانێ چی هەیە لەدەورو پشتی

-:مردوت مرێ کە بلوێر بەژێنی وا لەخواردنەوەش بووینەوە هەستە با بڕۆین.

لەمەیخانەکە هاتینەدەرێ شەو هەرچەندە درەنگ و سارد بوو: بەلام بڕیارمان دا تەختێك بگەڕێین، باش بوو باجی خورشید کەلەخانوەکەیدا ژوورێکمان لێ بەکرێ گرتبوو کلیلێکی دەرگای حەوشەی دابووینێ باکمان نەبوو ئەگەر بەرە بەیانیش بڕۆشتینایەتەوە. بەجووتە قۆڵمان کردبوو بەقۆڵی یەکدا بەکۆڵانەکاندا ئەگەڕاین، هەر کە گەیشتینە سیلەی کۆڵانێکی تەنگە بەر لەدوور تارمایی شتێکی گرموڵە دیاربوو ئەبزوتەوە دەنگی لێوە ئەهات. وەستاین و گوێمان شل کردوو چاومان بڕیە تارمایی یەکە بەلام هیچمان بۆ ئاشکرا نەبوو دوودڵ بووین نەمان ئەزانی بگەڕێینەوە دواوە یا بچین بۆلای، لەدواییدا پەتیارەی ماخۆلان پێی لێدا بەزەبریداو بڕیاری دا کە ئەبێ بزانێ ئەم شتە گرموڵە دەنگ دارە چییە، وردە وردە ڕۆیشتین تا لێی نزیك بووینەوە کەسەرنجمان دا پەتیارە قیژاندی:

-:کوڕە خۆ ئەوە بارام بەگە ئای سەیرکە چۆن لە قوڕەکەدا ئەگەوزێ.

-:وازانیمان چییە خێراکە بابڕۆین یەکێك لێرەدا بەم چەشنە بمان بینێ وابەپیاو خراپمان ئێ ئەگا بەلام پەتیارە کەللە ڕەقی گرتی و گوێی لەقسەکەم کەڕ کردوو لێی چووە پێشەوەو بەهەر نیخە نیخێك بوو هەڵی سانده سەرپێ منیش ناچاربووم یارمەتی بدەم بچمە بن قۆڵێکیەوە دیار بوو زۆری خواردبوەوە، زمانی لاڵ ببوو داوامان لێ کرد ناونیشانی ماڵەکەیمان بۆ هەڵبدا تا بیبەینەوە بەلام کەوتە پەلە قاژێ و بەحاڵ (ناڕۆمەوە)یێکمان لەدەمی بیست، هەتا بڵێی قینم لەپەتیارە هەستابوو بەتوورەییەوە پێم ووت:

-:ئەی ئێستا چی لەم کابرایە بکەین خێرا کە بلێ تایەکێك لەم بارەدا تەهاتووە بەسەرمانداو تووشی شتێك نەبووین.

-:ئەی بەینەوە ژوورەکەی خۆمان تا بەیانی لەوێ بێ پیاوەتی نیە بۆ ئێمە لێرە بەجێی بهێڵین



محرم لە ناوەراستدایە

ئەم ویست بەهەرجۆرێك بێ لەم هەلوێستە ناقۆلایە دەرباز ببین، بۆیە درێژەم نەدایە خێرا هەریەکەمان چووینە بن قۆڵێکی وە بەدارە دارەو هەر شەرە شەقێك بوو بارام بەگمان ئاخنی بەژوورەکەماندا، باش بوو شەو درەنگ بوو لەڕێگا کەسمان پێ نەگەیشت لەسەر لێفە شڕەکەی پەتیارە پاڵمان خست، هەر غەلبە غەلبی لێوە ئەهات و ئاخ و ئۆفی بوو پەتیارە جامێ ئاوی هێناو خێرا خێرا دەستە سڕە چلماویەکەی تێ هەڵ ئەکێشاو ئەیهێنا بەدەم و چاوو سەری بارام بەگدا؛ پاش سەعاتێك تەختێك هاتەوە هۆش خۆی چاوی کلۆفت و دانیشت هەردوو چاوی هەڵتۆقی بوون و سوور هەڵ گەڕابوون، دەستی گرت بەناوچەوانیەوەو کەوتە گریان و هەنسك. لەپاشا هەر لەخۆیەوە گرێی دەمی کرایەوە دەستی پێکرد:

-: پەری ..ئای کەنازدارو خۆشەویستی.

پەتیارە لێی پرسی؟

-: پەری کێیە؟

-:ئای بێفەڕ . پەری ئاناسی، پەری خان.

پەری خانی ژنم هەیە لەم شارەدا ئەیناسن.

ئەو ئافرەتە ڕۆح پەڕە قسە شیرینە. کە لێم ئەدا بە سۆلەکانی ئەڵێی دەستە گوڵم پیا ئەکێشێ.

بارام بەگ بەرە بەرە دەنگی...

بەرەو نوستن ئەڕۆیشت تابەلادا هات و کەوتە پرخە پرخ بەیانی کە لەخەو هەستا سەیرێکی من و پەتیارەی کردو بەقەدو باڵای خۆیدا ڕوانی خێرا کەوتە گیرفان پشکنینی خۆی، لەپاشا بەمۆنێکەوە سەیرێکی کردینەوەو ئەڕاندی:

-:هەی سەگبابینە.. ئەمەیە پاداشتی چاکە ئێوەی خوێڕیم دامەزراند لەکارگەکەمدا کەچی ئیمشەو کە لەماڵی برادەرێك گەڕاومەتەوە ڕێگاتان پێ گرتووەو هێناومتان بۆ ئێرە ڕووتم بکەنەوە. دە دینارتان لە گیرفانم دەرهێناوە باش بوو هەر ئەوەم پێبوو. والە ئێستاوە ئێوەم لەکارگەکەم دەرکرد. دەبڕۆن چەپەڵی خوێڕینە.

ئەمەی ووتو بەو توورەییەوە چوە دەرێ، منیش بە توڕەیی یەوە ڕووم کردە پەتیارەو ووتم:

-:ئەبخۆ ئەمە باشە؟ تۆ هەر بەلای بۆ من ئاخۆ ئەو ئەدینارە کێ ئەمشەو لەپێش ئێمەدا لەگیرفانی دەرهێناوە بەسەر ئێمەدا ساغ بوەوە. ئەوا ئیشە کەشمان لەکیس چوو بەسایەی پیاوەتی تۆوە.

ئیتر لەو ڕۆژەوە چاوم بەپەتیارە نەکەوتووە، تا ڕۆژێکیان لەمزگەوتەکەی قڕگە دانیشتبووم قاقەزێکیان بۆ هێنام کە کردمەوە ئەبینم خەتە ناخۆشەکەی پەتیارەیە بۆی نووسیوم کە کارگەکە بووە بەملکی میری وەڕێگا بەڕەڵلا کراوە بۆ ئەو کرێکارانەی دەرکراون بگەڕێنەوە سەر ئیشەکەی خۆیان.

بەلام من بووم بە مەلای مزگەوت تازە چیمە لە کرێکاری.

١٩٦٩

## چیرۆك

# شای قەرەجەکان

ئەمــەنی ئەگەیشــتە چــڵ ســاڵ، پیــاوێکی کەڵەگەتی گەنم ڕەنگ بوو، حەزی لە دەمەتەقێ زۆر ئەکرد هەر ئێوارەیەك ڕێم بکەوتایە ئیشتە جێی قەرەجەکان کە لەخوار (هۆمەرمەندان)ەوە دەواریان هـەڵدابوو بـەزەردە خەنەیەکـەوە ئـەهات بەپیرمـەوە زۆری لێ ئەکردم لەناو دەوارەکەی کـەمێك لەگـەڵیدا دانیشمو چایـەك بخۆمـەوە منیش دڵم نەئەشکاند قسەکانی زۆر بەتامو خۆش بوو، باسـی ڕەوشـتو ژیانی قەرەجی بۆ ئەکردم ئینجا ئەهاتە سەر باسی ئەو شارو وڵاتانەی دیبووی، جار جاریش نوکتـەی خۆشی تێهەڵکێش ئەکرد خۆی لەپێش منـدا ئەهاتە پێکـەنین بەتایبـەتی کەئەهاتـە سـەر باسـی فێـڵو فـەرەجی قەرەجـەکان کە چۆن بـەم ساویلکەییەی خۆیـان زۆر کـەرەت ئافرەتـە شارسـتانی یـەکانیان ئەفرە داوەو خەڵەتانوونیان. ئیتر بە کورتی یەکـەی پیاوێکی زیرەكو داناببوو وە لەوماوەیەی هاموشۆم ئـەکرد تـێی گەیشـتم کەهـەتا بڵێیـت دڵ نـەرمو بەتــەنگ هۆزەکەیەوەیــەتی بــەڵام دووسروشـتی سـەرنجی ڕاکێشـام بەلامـەوە سـەمەرەبوو یـەکێکیان بـاس کردنـی ڕەوشـتو خـووی قەرەجـەکان بـۆ بێگانەیـەکی وەکـو مـن کەئەمـە لەقەرەجـەوە زۆر دوورە. ئـەوی تریشیان جاروبـار لـە گەرمـەی روو خۆشی و قسەکردنیا لـەپڕێ دەنـگ ئـەبوو گـرژیو پەستی یەك لەڕوخساریا دیاری ئەدا وەکوو درکێك لەجگەری هەڵبچەقێ، بەڵام زۆر بەگورجی ئەچوە وە درخیــاتی پێشــوی وروخســاری ڕوون ئــەبوەوە وەئەکەوتەوە قسەکردن.

جارێکیان کە ئەم پەستی و گرژییە بەریدا خۆم پێ نەگیرا لێم پرسی:

—:ئەڵێی ئازارێکت هەیە؟..

زۆر بەڕەقیـەوە (نـەء)ێکی لـەدەم دەرپـەڕی کە ئەمـەم لێ چـاوەڕوان نەئـەکرد، دیـار بـوو ئـەم پرسیارەی بەدڵ نەبوو

کـات نیوەشـەو بـوو، لەژوورەکـەی خـۆم دا کەئەکەوێتـە تەنیشـت دەرگـای حەوشـەکەمانەوە خەریکی نووسینەوەی چیرۆکێ بووم کـە گوێم لە دەنگی دەرگـا بـوو زۆر بەبێزاریـەوە پێنووسـەکەم داناو لەبەر خۆمەوە ووتم:

—:ئێستا کـاتی هامشـۆ کردنـی ماڵانـە؟.. کـە دەرگاکەم کردەوە چاوم بە (حەسوئاغا) کەوت زۆر سەرسام بـووم، ئـەم کابرایـە بـەم نیوە شـەوە چی ئەوێ نەیخستە ئەوەی من پرسیاری لێ بکەم ووتی:

—:روخسـەتم ئـەدەی بێمـە ژوورەوە وە چـەند قسەیەکت لەگەڵ بکەم؟

ئەوی ڕاستی بێ لەپێشا خەریك بـووم دەست بەڕوویـەوە بنێم دەرگاکـە دابخەمـەوە، ناحەقیشم نەبوو چونکە قەرەج لەناو ئێمەدا ناوبانگی بەباش نەڕۆیشتوە، لە ڕۆژی ڕووناکدا سڵیان لێ ئـەکرێ چ جا بێ بەم درەنگ شەوە بەڵام کزۆڵێ یەکەیو ئـەو میوانداریەی ئەیکردم لەناو دەوارەکەیدا دڵی نـەرم کردمو لە ژوورەکەمدا بەرامبەر بەیەك دانیشتین.

حەسـوئاغا چـاوی بڕیبـوە بنمیچەکـەو خـێرا سمێڵی بائەدا، هەستم کرد لە تەنگو چەڵەمەیـەکی دەروونی زۆر توندو تیژدایەو دەماری بەئەندازەیەك گرژ بووە ماکابتەقێ، دیار بوو ئەیویست بە گورج تریـن کـات هـەرچی لـەدڵی دایـە هـەڵی ڕێـژێو بحەسێتەوە، بەڵام نەیئەزانی چۆن ئەم ڕازی دڵـەی خۆی هەڵبڕێژێ، ئەوی ڕاستی بێ لەوکاتەدا هەرچی کەساسی و کڵۆڵـی هەیە لەڕوخساریا دەر ئەکـەوت لەپاشا بەدەنگێك نازانم لەچی ئەچوو ووتی:

—:واخەریکە شێت ئـەبم ئەدەمە کێو.. نازانم چی بکەم. مرۆڤێکـی زۆر بـێ فـەڕو بایەخم، هیـچ نرخێکم نی یە، من مرۆڤ نیم.. هیچ نیم.. ئاخ چارەم بکـە. ئـەختێك تفـی قـوت دایـەوەو هەناسـەیەکی ساردی هەڵکێشاو کەوتە قسەکردن:

—:دەمێکە ئەمەوێ ڕازی دڵی خۆمت بۆ هەڵڕێژم بەڵام لەبەر ئەوەی هەر وەکو خۆت ئەزانی گـەورەی هۆزەکـەمم بەلامـەوە ناشـرینو بـار سـووکی بـو پریاسـکەی دڵـی خۆمـت بـۆ بکەمـەوە، هـەر لـەدڵی خۆمدا پیشم ئەخواردەوە تا گەیاندمە ئەم ڕادەیەی نارامی پـێ هـەڵگرتم خـەور خۆراکـی ئەهێشتووم نیمشـەو هـەر لـەناو جێگـادا تلاوەمتـەوە، هەست ئەکەم ئەگەر یـەکێ نەبێ تورەکەی دڵـی خۆمـی بۆ بکەمـەوە ئـەوەندەی پێ ناچێ شێت ئـەبمو ئەدەمە کێـو، لـەتۆش بـەولاوە متمانـەم بەکـەس نی یـە وە لەپاشـا لـەو بڕوایـەدام کە ئـەتوانی چارەیـەکم بـۆ بدۆزیتـەوە وە هـەر چـەندە دوودڵ بـووم کـە بـەم نیوەشەوە بەخەبەر بی بەڵام بەباشم زانـی هـەوڵێك هەر بدەم، سا ئەگەر نەشتوانم چاوم پێـت بکـەوێ بەشکم شنەی بایەکی ساردو گەرانێك گـرێ دەروونم دابمرکێنێتـەوە وەئـەختێك خـەو بچێتـە چـاوم لـەدەرەوە چاوم بەتیشکی روناکی کـەوت کـە لـە پەنجەرەکەتەوە ئەهاتە دەرێ بۆیە لەدەرگام دا

شای قەرەجەکان ئەختێك بێ دەنگ بوو، منیش بە سەرسوڕماویەوە سەرنجم ئەدایە، ئەبێ ئەو کێشە گەورەیە چی بێ کە تووشی ئەم پیاوە بووە وە بەم مەرەیەی لێکـردووە؟ زۆرم بـەزەیی پیـا ئەهاتـەوە بڕیـارم دا بەهـەموو توانایەکمـەوە یارمـەتی بـدەم وەزۆر پەرۆشیش بووم بەزۆری مەبەستەکەی خۆی بدرکێنێ، بۆیە هەردوو دەستم خستە ناو دەستیەوە وەبەزەردەخەنەیەکەوە پێم ووت:

—:برام دان بەخۆتا بگرە تەنگانە نی یە کۆتایی نەیەتو کێشە نی یە جێ بەجێ نەکرێ کێشەکانم بۆ ڕوون بکەرەوە تا بەپێی توانا یارمەتیت بدەم.

قەرەجەکە کە گوێی لە ووشەی یارمـەتی بـوو ئەختێك ڕوخساری ڕوون بوەوە ووتی:

—:توخوا.. تۆ بڵێی دەرمانێك هەبێ چارەی ئەو دەردە بەئاسـۆرەی مـن بکا: لەبـەرچی خـوا ئێمـەی قەرەجی لەسروشتی مرۆڤایەتی بێ بـەری کردووە.. نە نیشتمانمان هەیەو نە نەتەوە.. من مرۆڤایـەتی خۆمم لێ وون بووە.. پـەنام هێناوەتـە بـەرتۆ بـۆم بدۆزیتەوە ئەگینا یا شێت ئەبم یا خۆم ئەکوژم

زۆر بــەتوندی چــاوە فرمێســك قــەتیس تیاماوەکانی تێ بڕیمو چاوەڕوانی وەڵام بوو

منیش لـەدڵی خۆمـا ووتم ئەمەیە کێشـەکەی، ئەیەوێ نیشتمانو نەتـەوەی هـەبێ وەکـوو هـەموو خـەڵکێکی تر، بەڵام چۆن یارمـەتی بدەم وە لەم بێ هیوایی یە ڕزگـاری بکـەم؟.. بەواتایـەکی تـر چـۆن نیشتمانو نەتەوەی بۆ پەیدا بکەم؟.. بۆ ئەوەی خۆم ڕزگار بکەم لەم هەڵوێستە ناخۆشە پێم ووت:

—:ئەم خاکەی ئێوە دەوارتان لەسـەری هـەڵداوە نیشــتمانی خۆتانــەوە نەتەوەکەیشــی نەتــەوەی خۆتانە.

کـابرای قـەرەج بـەدەنگێکی بـێ هیوایی یـەوە ووتی:

—:بۆچی خۆشم ئەمەم ئەئەزانی.. بەڵام هەیهو.. هەیهو.. تـازە لـە کیس چووم.. نـە ئـەتوانم هیـچ نەتەوەیـەك بەنەتـەوەی خـۆم دابنێـم وەنەئەشـتوانم بەبێ نیشـتمانو نەتـەوە بژیـم.. جاران وائـەبووم گوێم نەئەدایە ئەمە.. منیش وەکو هەموو قەرەجێکی تر هەر چەندە هەستم ئەکرد ناتەواوییەکم تیا هەیە بەڵام ئەم ئەزانی چی یە لەبەر ئەوە باکم نەبوو.. بەڵام لـەو ڕۆژەوەی تـۆو چـەند هـەڤاڵێکی تـرت لـە نزیـك نیشتەجێکەی ئێمـە لەپەنا دار گوێزەکە دائەنیشتن منیش لەو دیوتانەوە گوێم لە گفتو گۆتان بوو لە بـارەی نەتەوەکـەتانو نیشـتمانەکەتانەوە ڕێگـاو پیلانتـان دائـەنا بـۆ ڕزگـار کردنـی لـە دەست داگیرکـەران، ئـەڵێم لـەو ڕۆژەوە بـۆم دەرکـەوت کـە ئێمەی قەرەج مرۆڤ نین، هەر کە چاوم بەتۆ ئەکەوێ بـێ فـەڕی خۆمـم بـیر ئەکەوێتـەوەو ئـەم بزوێنتـێ، ئەمەوێ ناتەواوی خۆم بەتەواوی تۆ پڕ بکەمـەوە. بۆیـە ئـەو ئێوارانەی بەناو دەوارەکانمانا ئەگـەڕێیت زۆر حەز ئەکەم لەگەڵم دانیشی.. خۆزگـە ئۆکـەرێك بوومایـە خـاوەن نەتـەوەو نیشـتمان نـەك شـای قەرەجـەکان.. ئاخ دەردم زۆر گرانـە تـازە لـەکیس چووم.

بەدەم ئەم قسانەیەوە وەکو لەرزی لێ هاتبێ هەڵ ئەچۆقی و فرمێسك بەچاریا ئەهاتە خوارێ. ئەختێك بێ دەنگ بـوو بـۆ ئـەوەی بـە دەستەسڕە ئاڵەکـەی فرمێسکی چاوی بسڕێتەوە لەپاشا بەتووڕەییەکەوە هەڵسایە سەرپێ و بەبێ ئـەوەی دوعـا خـوازی بکا خێرا بەرەو دەرگای حەوشە ڕۆیشتو هـەر ئەشی ووت تازە لەکیس چووم. تازە لەکیس چووم.

کــاتێك گەیشــتمە بــەردەرگا ئــەو لــەپێچی کۆڵانەکەدا وون بوو بوو: ئەوشەوە تابەیانی خەو نەچووە چاوم هەر دەنگی قەرەجەکە لەگوێما دەنگی ئەدایـەوە (نە نیشـتمانم هەیـە نـە نەتـەوە تـازە لەکیس چووم. تازە لـەکیس چـووم بـەیانی بەپەلـە پـەل خـۆم گـەیاندە نیشتەجێی قەرەجەکان ئـەبینم هەموو مۆڵیان خواردوە خەریکی شینو شەپۆڕو قوڕ پێوانـن بـۆ سـەرەکی هۆزەکـەیان، بـۆ حەسـۆئاغا کەخۆی خنکاند بوو.

١٩٦٩

چیرۆك

# بۆ خۆیی

خوله هەرچەند تەمەنی گەیشتبوە (٤٠) سال بەلام هێشتا دلی زۆر زەوقی بوو لە کاتی ئیش کردنیا پەست و دل تەنگ ئەبوو لەبەر بەرگە شڕو وورە پیسەکانی خوا خوای ئەوەی بوو کات خێرا بڕواو ئیش بەتال ببێ و بەرگە پاك و تەمیزو ووتوکراوەکەی لەبەر بکاو سەری چەور بکاو دای بهێنێ و بۆینی باخێکی وورشەدار لەملی ببەستێ و پێلاوەکانی بەبۆیاخ بریقەدار بکاو بگەڕێ بە شەقامەکاندا، موچەکەی کە مانگی (١٠) دینار بوو هەر بەشی ڕازانەوەی خۆی ئەکرد نوستن و خواردنیشی لەسەر پیرەژنەکەی دایکی بوو کە نان کەری مالان بوو.

گەلێ ئێوارە لە شەقامی مەولەوی چاوم پێی ئەکەوت جگەرەیەکی (گرێڤن) بەلای لێویەوە بەقیت و قۆزی پیاسەی ئەکرد ئەت ووت یەکێکە لەفەرمان بەرە گەورەکان وە لەبەر ئەوەی هەردووکمان لەیەك دایرەدا بووین هەر کەمێ بدیایە ئەختێك لام ئەوەستاو هەندێ ووتەی قووتی بۆ ئەکردم و بەجێی ئەهێشتم.

ئێوارەیەکیان کە هات بۆ لام زۆر گۆڕا بوو، خۆشی یەکی قوول لە دەروونی یەوە کاری ئەکردە سەر رووخساری رەنگێکی ئال هەلگەڕاوی لێ نیشتبوو چاوەکانی ئەبریقایەوە وەکو مثال ئەتریقایەوە، ئەو رۆژە هایبەخت(یانصیب) راکێشرابوو لەدلی خۆما ووتم هەبێ و نەبێ بەختی کراوەتەوە بۆیە لێم پرسی:

-: وا دیارە لە ڕاکێشانی ئیمڕۆدا بیتاقەیەکت بۆ دەرچووە؟.. بەفیزێکەوە ووتی:

-:بیتاقەی چی. لەبیتاقە زیاترم دەست کەوتووە ئاگات لە چی یە وا بووم بەشت، بووم بەپیاوێکی بەرزی ڕێز لێ گیراو لەناو خەلکیدا، ئێستا خەلکی بەپێی ئیشەکەم سەیرم ناکەن بەلکو بەپێی پیاوەتی خۆم نرخدارم ئەکەن گوێ بگرە تا بۆتی بگێڕمەوە بزانە چی ڕوویداوە. چۆن ئێستا خەلکی سەیرم ئەکەن بەڕاستی ئەمە شتێکی زۆر پەنهانە خۆشم سەرم لێی دەرناچێ چۆن وا گورج ئەم مەردوومە ئەگۆڕێ. پێکەنی بەلام پێکەنینێکی بەکول.. لەپاشا دەستی کردەوە بەقسە کردن.

-:دوێنێ لام وابێ هەر لەم کاتەدا بوو لەکۆلانێکدا دووکانێکم بەرچاو کەوت ویستم شخارتەیەکی لێ بکڕم خاوەنەکەی بەرزە پێ لەبەرم ڕاست بووەوە زۆر بەڕێزەوە سلاوی لێ کردم و بەبەگم.. بەگم بەدەورما هات و داوای لێ کردم لەلای دانیشم بۆ ئەوەی گەورەی بکەم هەروەکو خۆی ووتی: ئەوەی ڕاستی بێ شەرم گرتمی بەگورجی شخارتەیەکم لێ وەرگرت و دە فلسم دایەو سوپاسم کردوو بەجێم هێشت بەبێ ئەوەی چاوەڕێی باقی پارەکە بکەم، چۆن شەرم ئامگرێ و ئاشلەژێم یەکێك لەپڕ بەبەگم بەگم فەرموو دانیشەو گەورەم بکا بێ بەپیرمەوە کە تا ئێستا شتی وام بەخۆمەوە ئەدیوە.

خولە کە لەم قسانە بوەوە ووتی:

-:ئیتر خوات لەگەل.. یەك دوو هەنگاو دوور کەوتەوە بەلام دیسان وەکو شتێکی بیر کەوتبێتەوەو گەڕایەوە ووتی:

-:وەرە با بڕۆین بە چاوی خۆت بمبینە چۆن پیاوێکم بەزۆر ڕای کێشام و بردمی لەگەل خۆیدا کەلە دوکانەکە نزیك بووینەوە دوگمەی چاکەتەکەی داخست و هەنگاوەکانی هێمن کردەوە.

خاوەن دوکانەکە لەگەل کوڕێکی هەرزەکاردا دانیشتبوو کە چاوی بەئێمە کەوت هەر لەدوورەوە بە بەرزە پێ هەلساو سلاوێکی گەرمی کردو خولەش لەخۆشیدا مشەمشی هەناسەی ئەهات و وەلامی سلاوەکەی دایەوەو خەریك بووین لەدووکانە تێ پەڕین بەلام دوکاندارەکە لەدوکانەکەی هاتە خوارەوە وەکو پیاوێکی کلۆل لە بەردەمی شادا ڕاوەستێ ئاوا لەبەر دەممان وەستاو ڕوی کردە خولەو بەدەنگێکی لەرزۆك پێی ووت:

-بەگم. گەورەم. ئەو خزمەت کارەت (لەو کاتەدا کورەکە گەیشتە تەنیشتی) کوڕمە ئەمێکە بەبێ ئیش و کار ئەسووڕێتەوە بەشکم لای خۆتان دای بمەزرێنن بەفەرمانبەرێك قوتابخانەی ناوەندیشی تەواو کردووە خوا گەورەیی تان کەم نەکاتەوە. خولە لەم خواستە زۆر پەشۆکاو ڕەنگی تێك چوو ئاورێکی لەمن دایەوەو کەوتە بزەی هەرزەکارە کەش دەستە سڕێکی گرتبوو بەدەمەوە وەکو مەنجەل ئەکولا لەپڕ پیش خواردنەوەی بەهارەی پێکەنینێ تەقی یەوە، دوکاندارەکەی داچلەکاندوو کەوتە سەیری دەورووپشتی خۆی وەکو شتێکی لێ قەومابێ. کوڕەکەش لەباوکی نزیك بوەوەو شتێکی چرپان بەگوێدا، دوکاندارەکە لە کوڕەکەی مۆڕ بوەوەو لەخولە نزیك بوەو بەچاوە داخوراوە سور هەل گەڕاوە ڕیپۆقاویەکەی باش پیا هەلڕوانی، ئینجا ڕاستەقینەی بۆ دەرکەوت لەتەریقیدا سەری شۆڕکردوو ووتی:

-بمبوورە لێم تێك چووی.

خولە لەهەموو شتێك گەیشت کە هۆی ئەم لەبەر هەلسان و ڕێز لێ گرتنەی (بۆخۆیی)* چاوی دوکاندارەکەیە



بەبێ ئەوەی قسە بکا خێرا بۆی دەرچوو.

دوکاندارەکە لەگوڕەوە وەستایەوە چەپۆکێکی کێشا بەسەری کوڕەکەیدا کە هێشتا پێکەنینەکەی ئەگیرسابوەوە پێی ووت:

-هەتیو زوو بۆ پێت ئەوتم کەتەنەکە خۆلەکەی بەردەگاکەمان ئەم پیاوە ئەیکاتە جەوالی کەرەکەیەوە.

لاچۆ هەتیو ئەمە هەمووی بەهۆی تۆوەیە من وام زانی..

*بۆخۆیی : تراخوما

## چیرۆك

# ڕێگای ئازادی

-١-

لە ژوورێ لە ژوورەکانی نهۆمی دووهەمی خانوویەکدا لە گەڕەکی (کەرڕادە مریەم) پیرە مێردێك و پیرەژنێ لەسەر دوو کورسی لەگوێی (علاالدین)ێ دانیشتبوون. باران سەر بە کلاوە ئەباری. پاش ئەوەی کات ژمێری دیوارەکە یانزەهەمین دەنگی لێوە هات. پیرە مێردەکە جگەرەکەی لەناو تەپڵەکەکەی بەر دەمیا کوژانەوەو رووی کردە پیرەژنەکەو پێی ووت:

-دەبڵێی ئەم کوڕە تا ئەم درەنگ شەوە بەم سەرماو سۆڵەیە چی ئەکا لەدەرەوە؟

پیرەژنەکە بەدەم باوێشکەوە وەڵامی دایەوە:

-پیاوەکە، چی بکا بەدیار ئێمەوە. تازە لە (ئەردەن) هاتۆتەوە، ڕەنگە برادەرەکانی لە (یانەی) ئەفسەران زیافەتیان بۆ کردبێ.

پیرەمێردەکە دانەرپەوە ئەختێك ئاگری زۆپاکەی خۆش کردو دەستی کردەوە بەقسە کردن:

-ئافرەت، من وەکوو سەرنج ئەدەمە عەبدول کەریم ماوەیەکە گۆڕاوە، هەمیشە وەکوو بیری بەشتێکەوە خەریك بێ وایە. کەم قسە ئەکا، وە کەم لە ناوماندا دائەنیشێ. لەپێش ئەوەی بچێ بۆ ئەردەن وا نەبوو، تۆ بڵێی ئەوە ئیشی چی بێ؟

پیرەژنەکە لەسەر خۆ ووتی:

-ئەوەی ڕاستی بێ منیش هەستم بەوە کردوە، بەڵام هیچ قسەیەکی لای من نەدرکاندوە، خۆشم هەرچەند ئەکەم ناوێرم لێی بپرسم ئەوەکوو پێی ناخۆش بێ. هەتا یەت بەرەو لاوازیش ئەڕوا.

بڵێم چی پیاوەکە، خۆت ئەزانی لەهیچی کەم نیە، لەسپادا لەڕووتبەی (زەعیم) دایە وە دوا ڕۆژیشی زۆر ڕووناکە، وە لەبەر باشی و دڵسۆزی هەموو کەسێ خۆشی ئەوێ.

قاسم جگەرەیەکی داگیرساندەوەو پاش ئەوەی دووسێ مژی لێدا هاتەوە قسە:

-ئافرەت بۆ لەگەڵی خەریك نابی بەشکم لەکەڵ کەڵەی ژن ئەهێنان بێتە خوارێ بۆ خۆی خێزانێك پێکەوە بنێ، من وابزانم کوڕ بەقسەی دایك باشتر ئەکا. ئەگەر ئێستا ژن ئەهێنێ ئەی کەی ئەی هێنێ واتەمەنی گەیشتە (٤٣) ساڵ. من لام وایە ئەگەر ژن بهێنێ لەم پەستی و دڵ گیریە ڕزگاری ئەبێ.

-پیاوەکە هەتا ئێستا گەڵێ کەرەت لەم ڕووەوە ویستوومە دەرگای قسەی لەگەڵ بکەمەوە، بەڵام ئەو هەر لەسەر قسەی خۆی سوورە، نایەوێ ژن بهێنێ. نازانم مەبەستی چیە. من هەر لەکۆڵی نابمەوە، لەهەموو هەلێکدا قسە ئەهێنمەوە سەر باسی ژن هێنان بەشکم ئەمە خوایە بیری بگۆڕێ. ئەوە دەنگی دەرگایە وا بزانم هاتەوە. پیرەژن بەرەو دەرگای حەوشە ڕۆی. قاسمیش چوو بۆ ژوورەکەی خۆی.

عەبدول کەریم لەدالانەکە پاڵتۆکەی کرد بە سنگەکەیا و پێلاوە قوڕاویەکانی داکەن. ئینجا چووە ژوورەوە وەلەسەر ئەو کورسیەی باوکی لەوەوپێش لەسەری دانیشتبوو، دانیشت. دەستی بەسوپەکە گەرم ئەکردەوە کە ڕووی کردە دایکی ی ووتی:

-دایە ئەوە چۆنە هەتا ئێستا بەم درەنگ شەوە نەنووستوی؟

-ڕۆڵە هەتا ئێستا لەگەڵ باوکتا دانیشتبووین، باسی تۆمان ئەکرد. بەڕاستی مەسەلەی تۆ دڵی هەردووکمانی خستۆتە مەراقەوە.

بەسەر سوڕماویەکەوە سەری لەدایکی هێنایە پێشەوەو لێی پرسی:

-مەسەلەی من؟

دایکی بەزەردەخەنەیەکەوە وەڵامی دایەوە:

-ڕۆڵە ئێستا لەسایەی خواوە ڕوتبەیەکی گەورەت هەیە. وە هەرچی برادەرت هەیە هەموو لەتەمەن و ڕوتبەیا لە تۆ کەمترن، کەچی بوون بەخاوەنی ماڵ و منداڵ. تۆش لە کەڵ کەڵەی شەیتان وەرە خوارێ، خێزانێك پێکەوە بنێ. وا تەمەنت گەیشتە (٤٣) ساڵ ئەگینا لەمە بەدواوە بەبەرتەوە نامێنێ منداڵ بەخێو کەیت. با منوو باوکت کە عەمری پیرە مەرێکمان ماوە پت بینین بەدامەزراوی و چاومان بەمنداڵەکانت بگەشێتەوە.

کە دایکی لەم قسانە بوەوە، عەبدول کەریم سەری هەڵ بڕی و پێی ووت:

-دایە جارێ من ئامانجێکی زۆر گەورەم هەیە پەیمانم داوە تا ئەیەتە جێ ژن ناهێنم.

-کەواتە لەبەر ئەم ئامانجەیە وا شەوو ڕۆژ مێشکی خەریك کردووی. بەساقەت بم پێم ناڵێی ئەو ئامانجە چیە؟

-جارێ نەء

عەبدول کەریم ئەمەی ووت و هەستایە سەر پێ و بەرەو ژوورەکەی خۆی ڕۆی. لە (نووسراوخانەکەی)دا، پەراوێکی دەرهێنا لێی نووسرابوو (ستراتیجیەتی شۆڕش) بە پێ نووسی (ماوتسی تۆنگ) زۆر بە پەرۆشەوە کەوتە خوێندنەوەی. دایکیشی لەژوورەکەی خۆیدا ڕاکشابوو خەوی لێ تەتی بوو، هەر بیری لەو ئامانجە گەورەیە ئەکردەوە کە عەبدول کەریم پەیمانی داوە تانەیەتە جێ ژن نەهێنێ بەڵام هەرچەندی ئەکرد نەی ئەزانی چیە وە چۆن و کەی کوڕەکەی پێی ئەگا.

-٢-

ڕۆژ بەرز بووەبووەوە، دنیای بەتیشکە زێڕینەکەی گەرم کردبوو، خەڵکی بەشەقامەکاندا هەر یەکە بەرەو ئیشی خۆی ئەڕۆی. لە ڕادیۆی چایخانەکانەوە دەنگی قورئان بەرز ئەبووەوە. لەگەڵ ئەوەشا کە هەموو شتی ئاسایی ئەهاتە پێش چاو

بەڵام مرور بۆچی و دەمار گرژی لەڕووخسارو بزووتنەوەی زوربەی خەڵکەکەدا خۆی ئەنواند لە چایخانە کان و سووچی کۆڵانەکاندا سیان و چوار کۆمەڵیان ئەبەست و بەچرپە قسەیان ئەکرد، ناو بەناویش سەیری کات ژمێریان ئەکرد بەڵام کە پۆلیس یایەکێکی نەناسیاو دەربکەوتایە گورج بڵاوەیان لێ ئەکردو ئەڕۆیشتن بەرێی خۆیانەوە کات کە گەیشتە هەموو چایخانەکان جمەی ئەهات لەخەڵکی. هەروەها هەردووکانێ ڕادیۆی تیابوایە بەردەرگاکەی وەکو شارە مێروولە خەڵکی لێ هورووژابوو ئەمە وای ئەگەیاند هەواڵێك بڵاو ئەکرێتەوە. ئەوەندەی پێ ئەچوو دەنگی بێژەرەکە لە ڕادیۆوە بەرزبووەوە:

ئەی گوێ گرە خۆشەویستەکان، ئێستا بەیانێکی گرنگتان بۆ ئەخوێنمەوە کە لەلایەن بەڕێوەبەری پروپاگەندەی گشتییەوە دەرچووە.

کە بێژەرەکە ئەم بەیانەی بڵاو ئەکردەوە، خەڵکەکە هەتا ئەهات ڕووخسار یان بەرەو گرژی ئەڕۆی وە پریشکی قین لەچاویانا ئەدرەوشایەوە. هەر کە بێژەرەکە لە قسەکانی بوەوە، بەهەزارەها مستەکۆڵە بەرز بوەوە بە هاوار کردنەوە: بڕوخێ ئیمپریالیزم، بمرێ خائنی چەپەڵ نوری سەعید بڕوخێ پەیمانی شەڕاوی بەغدا. لەم کاتەدا کە ئەم هاوارانە بەرز ئەبوەوە، هاڕەی چەپڵە هات. یەکێك بە قەڵا دۆشکانی چەند کەسێکەوە بەدەنگێکی بەرز خوتبەی ئەخوێندەوە خراپی پەیمانەکەی بۆ گەل ڕون ئەکردەوە لەم کاتەدا پۆلیسێکی بێ شوومار بەدونکی و تفەنگەوە بەشاقاما بڵاوبوونەوە، گرژی



کەوتە ناو شارەکە ئەوەندەی پێ نەچوو پۆلیس بەتیلا لەخەڵکی بەربوون خەڵکیش بەمستەکۆڵەو بەردو دارو هەرشتێك بکەوتایە بەردەستیان وەڵامیان دانەوە. تا ئەهات خەڵکی زیاتر ئەڕژانە شەقامەکانەوە. وەتا ئەهات پۆلیسەکانیش دڕندەتر بەرەنگاری ئەم خەڵکە ئەبوون. لەپاشا بار بەچەشنێکی سام ناك گۆڕا کە لەسەربانی دایەرەی پۆلیسەوە هارەی شەست تیر بەرز بوەوە هەر منداڵو پیرو ئافرەتو لاو بوو وەکو گەڵای پایز بەرزئەبوونەوەو لە خوێنی خۆیاندا ئەگەوزین لەهەرچوار قوژنەوە شەست تیرو تفەنگو دەمانچە دەنگی ئەدایەوە. سەربانی دایەرەکانی میری بەگوێنیە خۆڵ کرابوون بەچەپەر لە کونەکانیانەوە لوولەی تفەنگ لێ هاتبوە دەرێ، شەقامەکانیش چۆڵو خامۆش بوون. هەر هەنگاوێك بڕۆشتیتایە چارت بەچەند لاشەیەك ئەکەوت لەخوێنی خۆیانا نقووم بوون. لە کۆڵانی گەڕەکەکەکانیشا ئافرەتەکان شینو شەپۆڕیان بوو. یەکێك هاواری مێردەکەی بوو ئەوی تر کوڕەکەی جار جاریش دەنگی هۆڕینی ئوتۆمبیل ئەهات کە یارپەپوشەکانی پۆلیس بوو بۆخەڵك گرتن ئەگەڕا، وە یائوتومبیلی نەخۆشخانەبوو. بریندارو کوژراوەکانی کۆ ئەکردەوە لای ئێوارە دەنگی تەقەنەما وەمیری بەڕادیۆ ئەم بەیانەی بڵاوکردەوە:

-٣-

کات (٨)ی شەوبو کە ئەفسەرێك خۆی کرد بەژورەکەی عەبدول ئیلاە داو سلاوێکی سەربازانەی لەبەر دەما کردو وتی:

*سەرۆك وەزیران لەبەر دەرگا ئەیەوێ بەخزمەتان بگا

*بابێتە ژوورەوە.

ئەوەندەی پێ نەچوو نوری سەعید هاتە ژوورەوە وەبەهەناسە سواری سلاوی کرد. پاش ئەوەی عەبدول ئیلاە داوای دانیشتنی لێ کرد، لەسەر کورسی‌یە پاڵی دایەوە. عەبدول ئیلاە دەستی نا بەزرِکەی بەردەمیا، کابرایەکی ڕەشی چاکەت سپی پانتۆڵ ڕەش هاتە ژووری بەکزوڵەیی لەبەر دەمیا ڕاوەستا. عەبدول ئیلاە پێی وت پیکێ ویسکی خەست بۆ نوری سەعید تێکا پاش ئەوەی نوری سەعید قومێکی لەپێکەکەی دا عەبدول ئیلاە بەزەردەخەنەیەکەوە پێی وت

*ها ئێمڕۆ ئەو سەرسەریانەت باش عاقڵ کرد!

نوری سەعید دەستی هێنا بەملیاو وتی:

*بەمەرەیەکم بردن پشتاو پشت ئەوێرن سەر هەڵبڕن.

*بەڕاستی هەر لەخۆت یەت بتوانی چارەی ئەم ئاژاوە گێڕانە بکەیت

نووری سەعید بەفیزێکەوە دەستی هێنا بەوورگیاو وتی:

*هیچ دڵ لەدڵ مەکەن. تامن لەدونیادابم هەرکەس سەر بەرزکاتەوە بەرانبەر بەئێوەو بەریتانیای گەورەمان سەری پان ئەکرێتەوە من نازانم ئەم ڕەشوو ڕووتە لەمە زیاتر چیان ئەوێ بۆ شوکری حکومەتی ناکەن کە لەسایەی سێبەریا لەتەڕ ئەخەون لەوورشك ئەنوون. ئەم دیموکراتی‌وە ئاشتی‌وقسە قۆڕانەیان لەچی‌یە خوا گەورەی داناوە فەرمان بکا، بچوکیش بەجێی بهێنێ

انشاالله هەر بۆمان ئەمێنێ، ئێمە هەر ئەوەمان ئەوێت باشت تەمیە کردین

نووری سەعید بەدەمارتووندیەوە وتی:

*دیارە کردەوەکانی منت هەمووی لەبیر چوتەوە. هەر بەریتانیایە کەمنی لەبیر ناچێتەوە، ئیمڕۆ لای ئێوارە باڵیۆزەکەی بەتەلەفون سپاسی کردم. ئێوە ئەگەر بڕوام پێ‌ناکەن، وەرن سەیرێکی نەخۆشخانە بکەن بزانن چەند لاشەی لێ کەوتوە. وەسەیرێکی بەندیخانە بکەن بزانن چۆن جمەی دێ لێم ببورە.

من لەقسەکەم مەبەستم ئەوە نەبوو بەتۆیا ڕانەپەرموومو ئیشی واباشت لەدەست بێ، بەڵکو هەر حەزئەکەم دەدوانزە کەرەت بۆمی بگێڕیتەوە بۆ ئەوەی دڵم بەتەواوی ئاوبخواتەوە ئەوی ڕاستی بێ ئەوەندەم ڕقێ لەو کەسانەیە کەناوی گەلو ئازادی‌و دیموکراتی ئەبەن ئەگەر بەلەوڕێچ خوێنیان بخۆمەوە ئۆخەی ناکەم. بەڕاستی دڵم ئوقرە ناگرێ تا ڕەچەڵەکیان ئەبڕیتەوە.

نووری سەعید کەوەختەوەبوو چاویلکەکەی بکەوێتە خوارێ، لە قەپۆزی لوتی توند کردەوە وتی: گەورەم هەموو شەوێ بەدڵی ڕەحەتی‌و بێ‌ئیگرانی بۆخۆتان بنوون. ئەوەتا لە ماوەی ئەم چەند ساڵەدا کە بەڕێوە بردنی کاروباری وڵاتتان بەمن سپاردوە، هەرچی هێزی بەرەبەرەکانی هەیە زدی ئێوە هەموویانم تەفرو تونا کرد. پەرلەمانێکم پێکەوە نا هەموویان لە دڵسۆزەکانی خۆمانن، بێ مقۆ مقۆ هەر یاسایەك ئارەزوو بکەم مۆری ئەکەن. بزووتنەوەی ئاشتیم کرد بەتاوان. دەمی ڕۆژنامەکانم بەست، پارتی‌یەکانم لەناو بردوە ئەندامە چالاکەکانیم لەبەندیخانە توندکرد. بەریتانیاو ئەمریکا لەچەكو جبەخانە درێخیمان لێ ناکەن بۆ ئەوەی خۆمان بپارێزین لەناحەزەکانمان. وەسپای بەریتانیای دڵسۆزمان لە حبانیە شەوو ڕۆژ پاسەوانمان ئەکات، سەرەڕای ئەمانەش ئێمڕۆ پەیمانی بەغداش مۆرکرا کەبەمە بەریتانیاو چوار دەوڵەتەکەی دراوسێمان ڕاستەخۆ وە ئەمریکا لەپەناوە ئەتوانن یارمەتیمان بدەن‌و فریامان بکەون ئەگەر خوانەخواستە مەترسیەك پەیدابوو ئەمانە هەمووی لەوێ بوەستێ، بەهەجەت عەتیەو ئائیلی حاجی عیسی خوا بەرخوداریان کا،



شەو ڕۆژ خەوو خۆراکیان لەخۆیان هەڵگرتوە بەهەزارەها چاویان[1] بەووڵات دا بڵاوکردۆتەوە هەرەیەکێ فزە بکا ئیتر هەر خۆیان ئەزانن چی لێ ئەکەن. ئیتر چی مەترسیەك ماوە گەورەم!

عەبدول ئیلاە هەڵسایە سەرپێ و نەختێك هاتوچۆی بەژوورەکەدا کرد. ئینجا لەبەر پەنجەرەکەیدا ڕاوەستاو پەردەکەی هەڵدایەوە، نەختێك سەیری پاسەوانەکانی کرد کە لەحەوشەکەدا بەتفەنگەکانیانەوە ئەهاتن و ئەچوون. لەپاشا لەجێگای خۆی دانیشتەوە، قومێکی لەپێکەکەیدا ووتی:

*ئەی سپاکەمان جێگای باوەڕە؟

*لە سپا مەترسە.. ئەو تەکبیرەی ئەو شەوە منو ئێوەو شا کردمان و بەیانی بەجێمان هێنا هەموو مەترسیەکی لەم لایەنەشەوە نەهێشت، ئێستا تیپەکان هەموو ناوچە گرنگەکانی سپا لەو کەسانە پاك کراو نەتەوە گەڵێان دوودڵ بووین وە ئەو کەسانە خراونەتە جێگایان کەزۆر دڵسۆزی خۆمانن.. عەبدول ئیلاە سەرێکی ڕاوەشاند ووتی:

*بەخوا پیاوێکی دانایت و ئیش زوو هەڵ ئەسووڕێنیت.

*دانایی ئێوەیە هی من نیە.. من هەر ئەوەندەم ئەوێ بەریتانیا و ئێوە گلەیم لێ نەکەن.. بەڵام ئەوی ڕاستی بێ شەوی ئاهەنگەکە داگیرتان کردم کە لەبەر خاتری باڵیۆزیئەمریکا فاضل جەمالیتان لەسەرو منەوە دانابو، وە لەمن زورتر رووتان ئەدایە، ئەمە ئەگەر هەر منی دڵگیر بکردایە قەیو سیا، بەڵام باڵیۆزی بەریتانیا پەست ببێ و زوو ئاهەنگەکە بەجێ بهێڵێ شتێکی زۆر ناخۆش بوو.. من نازانم گەوجێکی وەکوو جەماڵ چۆن پشتی پێ ئەبەستێ ئەو کەرە گوێ درێژەی لەهیچ کاتێکدا دەمی خۆی ناگرێ و سەر ئێشەمان بۆ پەیدا ئەکا.. هەر پیلانێك کە دای ئەنێن هێشتا ئێمە ڕێگامان بۆ خۆش نەکردوە ئەو بڵاوی ئەکاتەوە، هەر بۆ ئەوەی بڵێن لە هەموو شتێکدا دەستی هەیە.. ئینجا گێرە شێوێنەکانی ناو خۆشمان، وە دوژمنەکانمان لە دەرەوە وەکو یەکێتی سۆڤیەت و دەوڵەتەکانی تری ڕۆژهەڵاتی ئەورووپا ئەیکەن بەهەراو پیلانەکە سەر ناگرێ. پەیمانی پۆرتسماوسمان هێشتا لەبیر نەچوەتەوە کە هێشتا پوو نووسەکەی لە باڵیۆزخانەی بەریتانیا لە بەغدا بوو کەفاضل جەماڵ لە لەندەنەوە خۆی پێ نەگیرا نابڕوی بردین وە ئەوەبوو یەکێکیان خۆم بووم بەڕیشی سپییەوە ڕام کرد بۆ ئەردەن. عەبدول ئیلاە بەزەردەخەنەیەکەوە دەستی هێنا بەپشتی نوری سەعیداو پێی ووت:

*قەت وامەزانە ئێمە تۆ ئەگۆڕینەوە بە جەماڵ.. بەڵام خۆت ئەزانی پرۆژەی زۆر گەورەمان بەدەستەوەیە ئەگەر ئەمریکا پاڵ پشتمان نەبێ سەر ناگرێ.. تێ ئەگەی.. تێ ئەگەی مەبەستم چییە؟

نوری سەعید بەزەردەخەنەیەکی مەکر بازانەوە ووتی:

*بەڵێ تێ ئەگەم.. ئایزنهاوەر با هەر باوەڕ بەکوێ درێژی وا بکا.

*مامە.. من لەڕوی ئەم پرۆژەیەدا ساردت ئەبینم.. زۆر هەل باشمان دەست کەوت کەچی تۆ لەکیست داین.

نوری سەعید قومێکی لەویسکیەکەی داو جگەرەکەی داگیرساند و ووتی:

*خۆتان ئەزانن وا لە سیاسەتی دەوڵەتیدا ڕیشم سپی کرد. نابێ کارێ بکەین پەشیمانی لەدوا بێ.. ئەم ئیشە گەورەیە بەمەڵەشەیی ناکرێ.. ئێوە ئەوە بزانن سوریە هی خۆتانە، بەڵام هەندێ بار هەیە ئەبێ ڕێك بخرێ.. جارێ نە بەریتانیا کە خۆی لەپەیمانی بەغدادایە وە نەئەمریکا ناتوانن ڕاستەو خۆ یارمەتیمان بدەن، چونکە ئەوسا رووسیاش سنگ یەنێتە پێشەوەو دژمان ڕائەوەستێ وە ڕای گشتی عالەمیش لایەن گیریمان ناکاو بە موئامەرەیەکی ئیمپریالیزمی ئەژمێردرێت ئەم دوو دەوڵەتە دۆستەمان ئەتوانن لەژێرەوە یارمەتیمان بدەن و هەروەکو (مستر هەندرسون) لە ئەنقەرە لە خۆتی گەیاند. ئەبێ ئاژاوەیەك لەسووریە هەڵ بگرسێت وە چەند کەسێك لە خەڵکی سووریە بەم ئیشە هەڵبسێت. ئەوسا بەناوی دامرکانەوەی شەڕو پاراستنی ئاسایشەوە سپاکەمان ئەنێرین بۆ ئەوێ و داگیری ئەکەین. ئێستا هەر وەکو خۆت ئاگادریت لەم لایەنەوەگەڵێ هەنگاو هاویشتراوە.. لەسووریە چەند کەسێکمان بەپارە کڕیوە ئامادەن بۆ هەرا هەڵ گیرساندن، وە زۆر بەدوور بینی پیلان ڕێك خراوە..

ئینجا کەی وەختی هات هەمووشتێ بەدڵی ئێوە ئەبێ عەبدول ئیلاە، سەرخۆش بوو بوو کە نووری سەعید ئەم قسانەی بۆکرد، ناوبەناو هەڵ ئەستایە سەرپێ و بەژوورەکەیا ئەهات و ئەچوو، لەپاشا لەجێی خۆی دائەنیشتەوە. کە نووری سەعید لە قسەکانی بوەوە، سەری لێ نزیك کردەوەو بەدەنگێکی نزم پێی ووت:

ئەم هەتیوە دەستی بۆ ژورەکەی شا فەیصەل ڕاکێشا-بوە کۆسپ لە ڕێگاما تۆ دڵ سۆزی بۆیە بەئاشکرا پێت ئەڵێم ئەمەوێ خۆم بچمە سەر تەختی شایەتی هەمو وڵاتانی عەرەب، بەڵام ئەم دوو منداڵە حسێن و فەیصەڵ ئەم ڕێگەیەیان لێ بەستومەتەوە نازانم چی بکەم.

نوری سەعید بەزەردەخەنەیەکەوە ووتی:

-خۆشم ئەزانم تۆ زۆر لەهەردووکیان کارامەتری وەخزمەتێکی بێ پایانت هەیە بۆ بەریتانیا وەکو جەمال عەبدول ناصر سیلە ئەبوێ بەریتانیا بگۆڕێتەوە بەئەمریکا ئەم جارە کە لەلەندەن بووم کاربەدەستانی ئەویش ئەمە بیروڕایان بوو. جارێ دان بەخۆتا بگرە بەقسەی شێتێکی وەکو فاضل جەماڵ مەکە نە وەکو بەقەڵبەیەکتا بدا هەموو ئاواتێك پلە بەپلەیەتە جێ جارێ بامەسەلەی سوریە سەربگرێ و لەسەر تەختی ئەوێ بەبەرگی پاشایەتییەوە دانیشیت ئەوی تر ئاسانە ئوتومبیلێك و دار تەلێك. مردنەکەی خوا لێخۆشبو شاغازیت لەبیرە عەبدول ئیلاە پەلاماری نوری سەعیدی داو تیر ئەم لاو لای ماچ کرد لەپاشا پێکەکەی هەڵگرت و پێی ووت.

-نۆشکە بەخۆشی ئەو ڕۆژەی بەئاوات ئەگەین. ئەبێ تۆش بکەم بەوەلی عەهدم.

نوری سەعید دوا قومی پێکەکەی هەڵداو سەیری کات ژمێرەکەی مەچەکی کردوو ووتی:

-وا کات گەیشتە یەکی پاش نیوە شەو باپڕۆم سەرێکی تحقیقاتی جنائی بدەم بزانم تائێستا چەند کەس گیراوە.

-خوات لەگەڵ.

پاش ئەوەی نوری سەعید ڕۆیشت عەبدول ئیلاە هەستایە سەرپێ و وەکو ئارامی لێ هەڵ گیرابێ بەم سەرو ئەو سەری ژورەکەدا ئەهاتو ئەچو، هەر لەبەر خۆشیەوە ئەی چرپاند.

بۆم ڕاوەستن، شەرت بێ سەری هەمووتان پان بکەمەوە. سەری تۆش نووری سەعید. سەری تۆش فاضل جەماڵ. سەری ئێوەش فەیصەڵ و حسێن.. ئامەوێ کەس ببێ بەهاوبەشم لەفەرمان ڕەوایی.. ڕاوەستن بائەم پیلانە سەربگەوێ.

لەپاشا دەستی نا بەزەرەکەیا، کە کابرارەشەکە هاتە ژووری، عەبدول ئیلاە بەزمانێکی لاڵ ووتی:

*ئەو ئافرەتە ئەمریکایەیەوە ئیمرۆ لەلبنانەوە بۆیان ناردووم پێی بڵێ بابێتە ژوورەوە.

-٤-

ماوەیەکی دوور بەسەر ئەم کارەساتەدا تێ پەڕی، دووکان و بازاڕ دانرابوەوە، قوتابیەکان



چوبوونەوە قوتابخانە، بەیانیان هەر کەس ئەچوە سەر ئیشی خۆی. ئێوارانیش چایخانەکان پڕ ئەبوون لەدۆمینەکەرو تاوڵەکەرو نێرگەلە کێش. هۆی گوزەران تانەهات بەرەو خراپی ئەڕۆیشت، هەموو کاروکاسبیەك کەوتبوە ژێر دەستی کارگەو کومپانیەکانی بەریتانیا، بازرگانێتی ڕاوەستابوو. گەڵ لە بازرگانە نیشتمانیەکان نابووت بوو بوون وەفەلاحەکانیش لەتاو زورداری و چەوساندنەوەی ئاغاکان بەقەتار کۆچیان ئەکرد بۆ شار دزی و ڕێ گری و پیاو کوشتن و ڕەوشتی خراپ بوو بوو بەشتێکی ئاسایی. ئەمە لەلایەکەوە وە لەلایەکی کەشەوە، هەر کوشك و تەلار بوو بەئاسماندا ئەڕچوو شار وەك عەهدو وەزیرەکان سالی مانگێك ڕێیان ئەئەکەوتە پایتەخت، لەسەر حسابی ڕەنجی هەژاران بەشارەکانی ئەمریکاو ئەورووپادا ئەگەڕان ئیتر زۆربەی گەل لەهەموو سەرێکەوە دەردو دوو ڕووی تێ کردبوو. خاوەن تەلارو کاربەدەستە گەورەکانی لێ دەرچێ یەکێك نەبوو لێو بەبابروو دڵ تەنگ ئەبێ.

تەنها (علی افندی) نەبێ بەشی خۆی شو کردبوو هەر چەندیشە نەخاوەن کوشك و تەلار بوو، وە نە لەکاربەدەستە گەورەکان بوو لەسەردەمی دەوڵەتی عوسمانیدا (یوزباشی) بوو، وەپێش کۆتایی جەنگی یەکەم بە پارەیەکی کەم تەقاعد کرابوو. زور بەپەرۆش بوو بۆ سەردەمی ڕابوردوو، بەرگە سەربازیەکەی هێشتا هەر هەڵ گرتبوو بۆ یادگاری هەندێ کەرەت لە ماڵەوە لەبەری ئەکردو دارێکی بچوکی ئەکرت بەدەستەوە، وە لە دالانە درێژەکەی ماڵی خۆیانا بەفیزێکەوە سنگی دەرئەپەڕاندو هاتو چۆی ئەکرد. وای ئەزانی تابووری سەربازی لەدوارەیە. بەلام لەبەر ئەوەی گۆشتن و ورگن بوو بوو لەچار جارانیا بەم بەرگەیەوە دیمەنێکی سەیری هەبوو. پانتۆڵەکەی تۆزێ لەخوارو ئەژنۆیەوە لەقاچی تونگ ئەبوو، قۆڵ چاکەتەکەشی لە ئانیشکی بوو تەنها یەك هەڤاڵیش هەبوو لەشارەکەدا ئەویش حاجی قادر بوو، بازرگانی پێستە بوو. بەجەلەیە پێستەی ئەکڕی و ئەی نارد بۆ دەرەوەی عێراق، بەمە گوزەرانی زۆر باش بوو. بەلام لەم ساڵەدا کە بازرگانی ڕاوەستابوو. ئەمیش وەکو بازرگانەکانی تر کەوتبوە تەنگ و چەڵەمەیەکی گەورەوە. ئەم دوو هەڤاڵە هەر چەندە دۆستێکی گیانی بەگیانی بوون و هەموو شەوێ حاجی قادر لەدیوەخانەکەی علی افندی ڕای ئەبوارد، بەلام زۆر کەرەت ناکۆکی ئەکەوتە بەینیانەوە.

ئەو شەوە وەکو جاران پێکەوە دانیشتبوون، علی افندی لەسەر قەنەفەکەی پاڵ دابوەوە، قاچی خستبوە سەر قاچ نێرگەلەی ئەکێشا وە لەسەر سەمتی فرەی نێرگەلەکەی پێ‌ی ئەلەرانەوە. حاجی قادریش بەرامبەری دانیشتبوو. لەخوار ئەوانیشەوە کوڕەکەی علی افندی کە لەتەمەنی (١٥) ساڵاندا بوو، لەگوێ ڕادیۆکە دانیشتبوو. ئەم هەموو شەوێ ئەبوایە ڕادیۆی بۆ باوکی لێ بدایە بەلام لە ئەنقەرەو ئستەمبوڵ بەولاوە ئەئەبو هیچ ئیستگەیەکی تر بکاتەوە.

علی افندی پاش ئەوەی مژێکی باشی لەنێرگەلەکەی‌دا، ڕوی کردە حاجی قادرو پرسیارە ئاسایی‌یەکەی لێ کردەوە:

-ئێ، حاجی، چی هەیە چی نی‌یە؟

حاجی قادر بەدەم داگیرساندنی جگەرەکەیەوە ووتی:

-چی هەبێ علی افندی. خۆت ئاگات لە وولاتەکە نی‌یە؟ ئەوەتا هەر ئەوە ماوە بمان گرون، ئەم حکومەتە گەڵ فەوتاند کاروکاسبی هەمووی ڕاوەستاوە، دەرامەتی نەماوە. بەسەری تۆ چەند مانگێك ئەبێ پێستەکانم لەعەمباردا کەوتووە ئایەڵن بینێرمە دەرێ، خوا ئاگادارە هەزار دیناری لەسەر قەرزارم.

-گوێ مەدەرێ کار بەرەو باشی ڕوات. بەم نزیکانە باکوری عێراق ئەچێتە ژێر دەستی تورك، ئەوسا دنیا زۆر خۆش ئەبێ.

حاجی قادر ووتی:

-یا خوا قەت چاومان بەو سەردەمە ڕەشە نەکەوێتەوە. تورکەکانیش چیان پێ ئەکردین تەنانەت درەختەکانی گۆڕستانەکانیشیان سوتاند، وە هەزارەها لاویان نا بەگوللەی تفەنگەوە.

علی افندی بەنەرمە توورەیی‌یەکەوە ووتی:

-تۆش عەقلت چۆتە سەر عەقلی ئەم گەنجە گەوجانە- دەستی بۆ کوڕەکەی ڕاکێشا- ئەمەیان خۆت بووی بەکەفیلی تا بەریان دا. (فەرهادیشم خۆت ئاگاداری چی بەسەر هات. ئێستاش نازانم جێگای کوێیە. لەبەخت ڕەشی خۆمە لەباتی ئەوەی بۆم پێ‌بگەن و لەم پیریەما بەخێوم بکەن کەچی سەر



ئێشەو ماندوو بوونیم بۆ پەیدا ئەکەن. ئەوەتا بەشەو بەڕۆژ لەتاو فەرهاد خەوو خۆراکم نی‌یە وەختە بدەینە کێو. لەهەرا خوێناویەکەدا کەس ئەما نزاری کوڕم نەبێ خوتبە بخوێنێتەوە، باش بوو هەر ئەمیش کوژرا ئەو ئەفسەرەش خوا سەری لێ تێک داوە..

حاجی قادر قسەکەی پێ بڕیو ووتی:

-کام ئەفسەر؟ ئەوەی دراوسێتان؟

-بەڵێ، ئەویش جارو بارە کە یەت بۆ ئێرە دەست ئەکا بەم قسە قۆڕانە. بە زانیایە لەسەر ئەم بیرە خەتەرەیە (گەولایێ)ی کچم نە ئەدایە..

-بۆچی؟ کوڕێکی زۆر بەڕەوشتو باشە، سێ ئەستێرەی بە شانەوەیە.

علی افندی مژێکی لە نێرگەلەکەی‌داو ووتی:

-بەڵێ، بەڵێ، ئەویش ئەوەندەی پێ ناچێ ئەیگرن خۆم کێشم کەمە ئەویش بێتە سەر، دوور نی‌یە گەلاوێژیشی لەگەڵ ئەگرن، نازانم ئەم خەڵکە کە ئەتورکی ئەوی‌و ئەحکومەتی عێراق ئەی کێ یان ئەوێ؟ کێ ببێ بەشوانمان؟

حاجی قادر وەڵامی دایەوە:

-گەل ئەیەوێ بەسەربەستی لە سایەی ڕژێمێکی دیموکراتی ڕاستدا خۆی کاروباری خۆی بەڕێوە بەرێ. ژێر دەستەی بێگانان‌و کۆنەپەرستان نەبێ. ئەگەر ئێمە سەربەخۆو سەربەست بوونیایە ئەم دەردی سەریانەمان تووش ئەئەبوو:

علی افندی وتی:

-حاجی واز لەم قسانە بهێنە. من ئەزانم هەردوو کوڕەکەم هەڵ خەڵەتاون، بەڵام تۆ، ئەوە بەڕەو ڕووی خۆت ئەیلێم، کە پێستەکانت بڕەوی ئەبوو ئەکەوێتە جنێودان بەحکومەت، خۆ ئەگەر لەبرەو دابوو ئەم قسانەت هەمووی لەبیر ئەچێتەوە. هەردوو مانگ لەمەوپێش ستایشی حکومەتت ئەکرد، کەچی ئێستا حاجی لێم بوی بە بول شەویک سێ کەرەت لەسەر یەک مژی لە نێرگەلەکەی داو لەپاشا بانگی نزاری کرد سەرە نێرگەلەکەی بۆ تازە بکاتەوە.

کە نزار بەسەرە نێرگەلەکەوە هاتەوە، سەیری کرد باوکی چاو بە پارچە قاڵەزێکدا ئەگێڕێ، زانی نوسخەیەکە لەو بەیان نامانەی ئەمڕۆ خۆی بڵاوی ئەکردەوە. بۆیە زەردەخەنە کەوتە سەر لێوی. باوکی کەئەیخوێندەوە هەتا ئەمات زیاتر ناوچەوانی لۆچی تێ ئەکەوت. وە کە لەخوێندنەوەی بووەوە دایەوە دەست حاجی قادر. ئینجا دووسێ کەرەت دەستی هێنا بە قەبرغەی چەپیا ئەمە نیشانەی تووڕەیی‌و هەڵچوونی بوو. لەپاشا بەحاجی قادری ووت:

-ئەمانەی ئەمە ئەنووسن ناماقوڵ ئەکەن. بەڵێ بول شەویکەکان پی‌یان ناخۆشە عێراق پەیمان لەگەڵ تورکیا ببەستێ چونکە هەر ئەو ئەزانێ چۆن قەلاچۆیان ئەکا. من گومانم نیە لەئەنجامدا ئەم ووڵاتە ئەدالەوە بەتورک چونکە هەر ئەوان ئەزانن ووڵات بەڕێوە بەرن.

حاجی قادر پێی ووت:

-علی افندی تۆ بەناڕەوا هێرش ئەبەیتە سەر شیوعیەکان. خۆ خۆت ئەزانی من شیوعی نیم‌و هیچ پەیوەندیەکم پی‌یانەوە نیە، بەڵام خوا ڕاستەو ڕاستی لێ خۆ شیە، شیوعیەکان زۆر نیشتمان پەروەرن لەپاشا ئەم بەیان نامەیە وەکو لەدامێنیا نوسراوە هی شیوعیەکان نیە بەتەنها هی بەرەی نیشتمانی یەک گرتووە کە هەموو هێزە نیشتمانی‌یەکانی گەل ئەنوێنێ.

علی افندی بەم قسانە ئێجگار ئەماری توند بوو. وە بەدەنگێکی بەرز ووتی:

-ئەڵێ‌ی هی بول شەویکەکان نیە؟ ئەی بژی برایەتی کوردو عەرەب، بژی برایەتی هەموو گەلان، بژی ئاشتی چیە؟ حاجی تۆ گەوجی یا خۆت گەوج ئەکەی ئەگینا لەمنی باشتر ئەزانی ئەمانە هەمووی بەیت‌و بالۆری بول شەویکەکانە. بول شەویکن.

نزار تا ئەم ڕادەیە دانی بەخۆدا گرتبوو پێشی ئەخواردەوە، بەڵام کە باوکی بەم ڕادەیە هێرشی بردە سەر نیشتمان پەروەرەکان ئیتر خۆی پێ‌نەگیراو هەڵ دایە:

بابە-شیوعیەکان لە هەموو کەسێک زیاتر خۆیان بەخت ئەکەن لەپێناوی ڕزگاری‌و سەربەخۆیی ووڵاتدا، وەلەپاشا ئەم دروشمە هەر هی شیوعیەکان نیە، بەڵکو بوە بە ویردی سەر زمانی هەموو مرۆڤێکی بەشەرەف. کە نزار ئەمەی ووت علی افندی ئێجگار چاوی پەڕیە پشتی سەری‌و ئەڕاندی:

-ئەمە دایکت تەربیەی دیاوی لەقسەی لەخۆ گەورەتردا هەڵ بدەیتێ؟ بەڵێ هەتیوەکانم هەردوکیان بول شەویکن. ماڵی خۆیان کاول کرد خەریکن ماڵی منیش بەقوڕ ئەگرن، حاجی ئەمە شەوەکەیەو ئەیلێم نزار لەسەر ئەم ئەتوارە بڕوا ئەی گرنەوە ئینجا ئەوسا پارەی کەفالەتەکەی کە (٥٠٠) دینارە من لەباتی تۆ بیدەمەوە.

کە علی افندی ئەم قسانەی ئەکرد نزار ڕەنگی سوور هەڵ گەڕاو جارو بارە سەیری حاجی قادری ئەکرد وەکو داوای لێ بکا فریای کەوێ لەم هەڵچونەی باوکی ڕزگاری کا. لەپاشا کە علی افندی بێ دەنگ بوو سەر حاجی قادر بەنەرمی پێ‌ی ووت:

-علی افندی، تۆ لە خۆڕایی خۆت سەغڵەت ئەکەی. نزار کوڕێکی زیرەک‌و وریایە لە هەڵەشەیی پێشوی دەرسی وەرگرتوە، باوەڕم هەیە ئیتر کارێکی واناکا جاسووسەکان زەفەری پێ بەرن. خوا نەخواستە ئەگەر هەر گرتیشیان تۆ گوێ مەدەرە(٥٠٠) دینارەکە من هەزارم چوە با ئەویشی بچێتە سەر. ئەمانە باکیان ئەبێ گیانی خۆیان لەپێناوی گەلدا بەخت بکەن بۆ من بۆ پارەیەک وەکو چڵکی دەست یەت‌و ئەڕوا باکم بێ. لەپاشا ئەمیش خۆ لە هەموو لاوانە زیاتر نیە کە لە تاریکایی زیندانەکانا ئەژین، بەخوا لەنزاری تۆ ناسک‌و نازادر تر بەخێو کراون.

کە حاجی ئەمەی ووت، علی افندی ئەوەندەی تر قینی هەڵسا، سدارەکەی کێشا بە مێزەکەی بەردەمیاو ئەڕاندی:

-تۆش، تۆش حاجی؟ لەباتی ئەوەی یارمەتیم بدەی ئەم کوڕەم لەداوی بولشەویکەکان ڕزگار بکەم ئەوەکو وەکو براکی تری لێ بەسەر بێ کەچی هانەهانەی ئەدەی. من ئەزانم کە گیراشەوە پی ئەخەیتە ریسی ملم بۆ (٥٠٠)دینارەکە، ئەوسا ئەبێ خانوەکەمت بۆ بفرۆشم. من نامەوێ بولشەویک لەم ماڵەدا بێ. لەسەر ئەم بیرو باوەڕە لانەدا ئەری ئەکەم. دەبڕۆن ئیتر بەڕۆکم بەرنەن..

علی افندی بەتوڕەیی‌یەوە هەستاو بەتوندی دەرگاکەی لەدوای خۆیەوە دا بەیەکاو ڕۆی بۆ ژوری نوستن.

نزار تابەردەرگای حەوشە لەگەڵ حاجی ڕۆی. لەبەر دەرگا حاجی بەنزاری ووت:

-لەباوکت دڵگیر مەبە. خۆت ئەزانی پیاو کەبەساڵاچوو تووڕەو تڕۆ ئەبێ‌و بیرو باوەڕی لەگەڵ هی وەچەی ئێستا ڕێک ناکەوێ. بەڵام دڵی زۆر پاکە، سبەینێ هیچی لەدڵ نامێنێ. خۆت ئەزانی ئێمە هەموو شەوێ لەگەڵ باوکتا بەدڵ نازاری‌یەکتری بەجی دێڵێن، کەچی بەیانی خۆی یەتەسەر دووکانەکەم‌و ئاشتم ئەکاتەوە، وە بۆ شەوی داهاتوو خێرا یەمەوە دیوە خانەکەتان.. ئیتر شەوباش.

-٥-

شەوێ لە شەوەکانی مانگی حزیران شنەی بای دجلە لەگڕی گەرمای ڕۆژی کەم کردبووەوە. لەباخچەکەی یانەی ئەفسەران چوار ئەفسەر دوانیان لەڕوتبەی عەقیدا، وە یەکێکیان لە ڕوتبەری



مقەدەما، ئەوی تریشیان لەروتبەی ڕەئیس دا، لەگوێ مێزێك دانیشتبوون سێیانیان ئەزنیفیان نەكرد، ڕەئیسەكە چاوی بریبوە دەرگای حەوشە ئەوەندەی پێ نەچوو ئەفسەرەكە بەپەنجە تەقە تەقی لە مێزەكە هێنا هەر سێ ئەفسەرەكەی تر سەریان هەڵبڕیو ڕاستەو خۆ سەیری دەرگای حەوشەیان كرد چاویان بەئەفسەرێكی باڵابەرزی لاواز كەوت لەبەر دەرگاكە ڕاوەستابوو چاوی بەحەوشەكەدا ئەگێڕا. لەپاشا لەسەر خۆ هاتە ژوورێو بەزەردەخەنەیەكەوە بەلایانا تێ پەڕیو، وە لە قوژبنێكا دانیشت ئەفسەرە ڕەئیسەكە بەچرپە بەهەڤاڵەكانی ووت:

-پێشەوا لەوەختی خۆیدا هات

هیچیان وەڵامیان نەدایەوە هەر ئەوەندە نەبێ سەریان دانەواندەوەو كەوتنە ئەزنیف كردن پاش تۆزێك ئەفسەرە مقەدەمەكە سەیری كات ژمێری مەچەكی كردو ووتی:

-كات یە. پێشەوا ئان ئەخوا هەستن با بڕۆین. پاش تێپەڕ بوونی نیو سەعات بەسەر ڕۆیشتنی چوار ئەفسەرەكەدا ئەفسەرە كەڵەگەتە لاوازەكە كە بەتەنها دانیشتبوو نانی ئەخوارد پارەی خواردنەی داو ڕۆیشتە دەرێ لەبەر دەرگا سواری تەكسی بوو، بەشۆفێرەكەی ووت بیبا بۆ سلێخ( ) لەجێگایەك لەنزیك (سلیخ) بەشۆفێرەكەی ووت ڕاوەستێ، پاش ئەوەی كرێكەی دایە، لەشەقامەكە لای داو خۆی كرد بەكۆڵانێكدا، پاش چارەكە سەعاتێك ڕۆیشتن بەناو ئەم كۆڵانو ئەو كۆڵانەدا، گەیشتنە بەر خانویەكی یەك نهۆمی بەرەنگی زەرد بۆیە كرابوو. لە لەوحەكەی سەر دەرگاكە نوسرابو (عقید عبدالله). بەم لاو ئەولای خۆیدا ئاوڕی دایەوە، كەزانی كەس دیار نییە دەستی نا بەزەنگی دەرگاكەدا. ئەوەندەی پێنەچوو یەكێك لەودیوەوە بەدەنگێكی گڕ پرسی:

-كێیە؟

-(ئاگر)گورج دەرگاكە كرایەوەو خۆی كرد بەژوورا. عەقید عبدالله دەستی گوشی و پێی ووت:

-بۆ ناو ساردادوەكە، برادەران لەوێن.

عەبدول كەریم لەپێش عەقید عبدالله گەیشتە ناو ساردادوەكە، سێ ئەفسەرەكەی لەیانەی ئەفسەران ئەزنیفیان ئەكرد بەرزە پێ لەبەری هەڵسانو سلاوێكی سەربازانەیان بۆ كرد. ئینجا هەر پێنجیان دانیشتن زەعیم عبدول كەریم بەپێكەنینەوە ووتی:

-ئەوەندەی نەمابوو ووشەی نهێنیەكەم لەبیر بچێتەوە.

عەقید عبدالله بەزەردەخەنەیەكەوە وەڵامی دایەوە:

-بەخوا ئیمەش دەرگامان لێ نەئەكردنەوە. بەڵام ئەوەی باشە ووشەی (ئاگر) ئاسانە لەبیر ناچێتەوە.

لەم كاتەدا منداڵێك لە سوراحیەكدا شەربەتی پرتەقاڵی بۆ هێنان، پاش خواردنەوەی شەربەتەكەو ڕۆیشتنی منداڵەكە، زەعیم عەبدولكەریم ڕوی تێ كردن و ووتی:

-لە (مەنصور)ەوە یەكسەر هاتم بۆ یانە، نەچووم بۆ ماڵەوە، تاقەتم نییە وەڵامی پرسیارەكانی دایكم و باوكم بدەمەوە. بۆ بەم درەنگ وەختە هاتوی؟.. بۆچی هاتوی.؟ دیارە لەوەختی خۆیدا نوسراوەكانم پێتان گەیشتوە.. بەڕاستی زۆر سوپاستان ئەكەم كە باش پەیڕەوی تان كردوە بەتایبەتی كۆبونەوەتان لەیانە لەو وەختەی بۆم دانابوون وەهاتنتان بۆ ئێرە.. من بۆیە ئێرەم هەڵ بژارد چونكە جێگایەكی پەنایە وەدەرو دراوسێی خراپی لێوە نزیك نیە.

هەروەها عەقید عبدالله خۆشی شوبهەی لەسەر نیە.. من هەرمەترسیم لەوە بوو ووچانم نەدەنێ بێم بۆ بەغدا، بەڵام باش بوو ئەمەش تەگەرەی تێ نەكەوت پاش تۆزێ بێ دەنگ بوون، سەیری كات ژمێرەكەی دەستی كردو هاتەوە قسە:

-براكانم وەختمان كەم بەدەستەوەیەو ئیشی زۆر گەورەشمان لەسەرشانە پێویستە زۆر بەچالاكیو دوور ئەندێشیو وریایی بجوڵێینەوە تا بتوانین بەگورجی بەری خەباتی ئەم چەند ساڵەمان بكەینەوەو گەلەكەمان لەچەوساندنەوەو كۆیلەیەتی ڕزگار بكەین كار بەخێرای ئەڕوا تەنگو چەڵەمەی ئیمپریالیزمو كۆنە پەرست لە وڵاتەكاندا گەیشتۆتە پلە كۆتاییەكەی.. لەبەر ئەوە ئەم كۆبوونەوەمان گرنگییەكی زۆر گەورەی هەیە. كووبوونەوەكانی كەمان بۆ خۆ ئامادە كردنو خۆڕێك خستن بوو، بەڵام كۆبونەوەی ئێستامان بۆ بزووتنەوە قەلامبازێكی شۆڕش گێڕانەی نزیكە بۆ سەر قەڵای شایەتیو ئیمپریالیزم.. جا بۆ ئەوەی سەپەرشتی كاری خۆیان بینەوە بزانین چۆن ئەبزوینەوە پێویستە بەگورتی باسێكی ئەو كارەساتە سیاسیە بكەین كەلەدەرەوەو لە ناوەوە ڕوی داوە لەم ماوەیەدا، وە لەپاشا هەریەكەمان باسی ئەو كردەوانە بكا كە لەكۆبوونەوەی پێشوودا خستبوومانە ئەستۆی خۆمان بەجێی بهێنین بۆ ئەوەی بزانین تا چ ئەندازەیەك ئیشمان ڕۆیشتوە بەڕێوە نابێ لەخۆمان بایی بین.. هەر هەنگاوێك ئەنێین كە ئەبێ ئەنجامی لێكۆڵینەوەو وردبونەوەیەكی تەواومان بێ.

زەعیم عەبدول كەریم زۆر بەدەنگێكی سازگار پڕ لەهیواوە بە دوارۆژێكی نوێ ئەم قسانەی ئەكرد، پرشنگی وریاییو نازایی لە چاوەكانیا ئەدرەوشایەوە لەبەر ئەوە قسەكانی زۆركاری گەر بوو، لەهەڤاڵەكانی بۆیە بەدڵ گوێ یان لێ گرتبوو وەهەناسەیان لەخۆیان بڕی بوو

پاش تۆزێ بێ دەنگ بوون هاتەوە قسە بۆشیی كردنەوەی هۆی ئەنجامەكانی ئەو كارەساتە سیاسیانەی لەرۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا ڕوی داوە لەپەیمانی شەڕاوی بەغداوە دەستی پێكرد تایەك گرتنەكەی بنەماڵەی هاشمی لەبەغداو لە ئەردەن. ئینجا ووتی:

-براكانم: حكومەتی نووری سەعیدی خائن بەئاشكرا چەكو سپا ئەنێرێ بۆ لبنان بۆ پشت گیری (كەمیل شەمعون)ی نۆكەری امریكا كە ئەوەندەی نەماوە دكتاتۆریەتەكەی لەبەر شاڵاوی نیشتمان پەروەرە شۆڕش گێڕەكاندا لەڕیشە بێتە دەرێ. ڕەبڕیار وایە دەوڵەتەكانی پەیمانی شوومی بەغدا لەمانگی داهاتوودا لە ئەنقەرە كۆببنەوە بۆ ئەوەی پیلان دابنێن بۆ داگیر كردنی سوریەو ترساندنی بەعێراقەوە، وەبو ئەوەی پەلاماری بزوتنەوەی نیشتمانی بدەن لەم ناوچەیەدا كەڕۆژبەڕۆژ بەرزترو ئەبێتەوەو سوودی امپریالستەكان وەكۆنەپەرستەكانی خستۆتە مەترسی یەكی گەورەوە. ئەمانە هەمووی لە لایەكەوە، وەلەلایەكی كەشەوە گەلەكەمان لەڕووی ئابووریو تەندروستیو سەقافیو كۆمەڵایەتی یەوە هەتایەت بەرەو خراپی ئەڕوا. نیشتمانی خۆشەویستمان كراوە بە

بەندیخانەیەکی گەورە گەلەکەمانی تیا کۆت‌و زنجیر کراوە. ئەمانە هەمووی بوە بەهۆی ئەوەی قین‌و بێزاری گەلەکەمان بگاتە ئەوپەڕی‌و زیاتر تینی بزوتنەوەی رزگاری بەرز بکاتەوە. ئێستا گێژەڵوکەی شۆڕشی وەختە هەڵ بکا جائەبێ زۆر بەباشی ئامادەو هۆشیارو دووربین بین وەتا ئەو رۆژە یەتە پێشەوە خۆمان بپارێزین لەهەر کردەوەیەك کەلەبەر چاوی کاربەدەستان ئاشکرامان بکا. ئەبێ بزانین هەڵەیەکی بچووك ئەم چەند ساڵەمان لەکیس ئەدار درێژە بەئازاری گەلەکەمان ئەدا.

پاش ئەوەی زەعیم عەبدول کەریم لەقسەکانی بوەوە هەریەکەیان ئەوەی لەکۆبوەنەوەی پێشودا پێ‌ی سپێردرابوو بەجێ بهێنێ گێڕایەوە لەپاشا نۆرە هاتە سەر رەئیس بەکرو وتی:

لەسەر بڕیاری کۆبوونەوەی پێشوومان بەهۆی گەلاوێجی دەست گیرانەوەتوانیم دەنگمان بگەیەنم بە (فەرهاد)ی برای‌و ئامانجەکانمان لە بەرەی یەك گرتوی نیشتمانی بگەیەنێ دوێنێ گەلاوێج وەڵامەکەی بۆ هێنامەوە دەستی کرد بەگیرفانیاو پارچە قاقەزێکی بچووکی دەرهێناو کەوتە خوێندنەوەی:

برا ئەفسەرە ئازادی خوازەکانمان

بەدڵ‌و بەگیان لایەن گیری بزوتنەوەکەتان ئەکەین هەموو توانایەکمان پێش کەشتانە لەپێناوی رزگاری گەل‌و نیشتماندا

بەرەی یەك گرتووی نیشتمانی

زەعیم عەبدولکەریم لەخۆشیا دەستی دابەیەکداو وتی:

-زۆر زۆر خۆشە بەڕاستی سەرکەوتنێکی گەورەیە بۆ بزوتنەوەکەمان کە توانیمان دەنگمان بگەیەنین بە بەرەی نیشتمانی یەك گرتوو کە لەپارتە نیشتمانیە دڵسۆزەکان پێك هاتوە لە دەمێکەوە خەبات ئەکەن ورێگا خۆش ئەکەن بۆ شۆڕشی رزگاری.

مقەدەم رۆستەم ڕوی کردە رەئیس بەکرو وتی:

-مەڵ گەلاوێج بڵێ گەلاوێژ ئەگینا دەست گیرانەکەت لێت ئەتۆرێ. بەڕاستی فەرهاد نیشتمان پەروەرێکی ئەبەزە لە هەولێر دراوسێمان بوون. لەپاشا کەچوو بۆ بەغدا لەحقوق بخوێنێ، علی افندی باوکی دڵی بروایی ئەدا بەتەنها رەوانەی‌بەغدای بکا بەماڵەوە لە گەڵیا هات بۆ ئێرە، بەڵام ئەوەندەی پێ نەچوو فەرهاد گەڕایەوە پاش ئازاردانێکی زۆر بیست ساڵ بەند کرا لەپاشا توانی لەبەندیخانە رابکاو خۆی بشارێتەوە، رۆژنامەکان لەوەختی خۆیدا لەسەر موحاکەمەی فەرهاد وراکردنی زۆریان نووسی:

مقەدەم جابر کەتا ئەوکاتە هەر گوێی ئەگرت‌و قسەی نەئەکرد هەڵ دایە:

-بەڵێ، ئێستاش ئەو رۆژنامانەم ماوە کە ئەو باسە ئەگێڕنەوە بەڵام باجاریێ واز لەمە بهێنین من وا بەبەرژەوەندی ئەزانم هەر لەسبەینێوە دەست بکەین بەشۆڕش.

عەبدول کەریم لەسەر خۆ پێ‌ی وت:

براکەم شۆڕش هەڵگیرساندن چەند مەجێکی هەیە تائەو مەرجانەی ئەگا هەڵ ناگیرسێ. ئاو هەر بەگەرم کردن نابێ بەهەڵم تا ئەگاتە پلەی تایبەتی خۆی دان بەخۆتا بگرە ئەوەندەمان ئەماوە ئەردی ئەڵێن گامان گروە کلکی ماوە.

لەپاشا روی تێ‌کردن وتی:

باهەر لێرە جێگا ڕاخەین بنوین.. شەو درەنگە بەیانی زوو ئەبێ بگەرێمەوە (مەنصور)..

-٦-

لەکۆڵانێکی تاریکدا لەگوێ روباری (دیجلە) خانوویەکی دوو نهۆم هەیە. ئەگەر لە لەوحەی سەر دەرگاکەی ووربیتەوە موچڕکەیەك بەلەشتایە. شێوەی گەڵ ماریێ‌و هەقاڵت یەتە پێش چاو کەلەو دیو ئەم دەرگایەوە لەژێر دارو قامچیدا لەناو چوون‌و لاشەکەیان فڕێندراوەتە روبارەکەوە. گەڵی زیندانی قووڵ‌و تاریکت یەتە پێش چاو کەئەگەر تیایانا پێستیشت بگروون دەنگت بەکەسدا ناگا.

ئەو لەوحەیە لەسەری نووسراوە (تحقیقاتی جنائی). لە داڵانەکەیەوە کە تێ پەڕیت ئەگەیتە حەوشەیەکی چوار سووچ. بەدەستە چەپتا ژوورێکی لەسەر دەرگاکەی نووسراوە (ژوری ئێشك گرەکان) بەڵام قەت ئەم ژورە ئێشك گری تێ نەچوە لەوانە ئەبێ کەمێری قینی لەبیرو باوەڕیان. ئینجا ئەگەر بەدەستە ڕاستدا پێچ بکەیتەوە بەداڵانێکی تری کورتدا ئەچێتە ناو حەوشەیەکی تر ریزە ژوورێکی تیایە، سیانیان هەمیشە دەرگاکانی خڕ داخراوەو قەدەغە کراوە کەس بچێ بەلایانا. ئەگەر چەند هەنگاوێکی تر لەوان ڕەت بوی ئەگەیتە بەر ژوورێکی تر لە لەوحەکەی سەر دەرگاکەی نوسراوە (معاون نائل حاجی عیسی)

نائیلی حاجی عیسی کابرایەکی چوار شانەی تێك سمراوی قژ زەرد بوو بەپیاوێکی زۆر درندە ناوبانگی رۆیشتبوو. کات (١٢)ی نیوەڕۆ لە ژوورەکەی خۆی دانیشتبوو، هەرچەندە ژوورەکەی سارد کەرەوەی( ) تیا بوو بەڵام دەستە سڕەکەی هەر بەدەستەوە بوو خێرا خێرا ئارەقی دەموو چاوی‌و پشت ملی‌ی پێ ئەسڕیەوە. لەبەر دەمیشیا (فالیکی‌،٢) واڵا کرابوەوە زۆر بەووردی چاوی‌ی بەپەڕەکانیا ئەگێڕا لەم کاتەدا بەهێواشی لەدەرگای ژورەکەی درا. سەری هەڵ بڕی‌و بەبێزاریەکەوە وتی:

-کێ‌یە؟

کابرایەکی کورتە بنە، ئاوڵە پەردەکەی لوتی چەپی‌ی خواردبوو هاتە ژوورەوە پاش سڵاوکردن بەنائیلی وت:

-بەگم، لەوساوە من دانراوم چاودێری ماڵی علی افندی بکەم کەس نابینم هاموشویان بکا، کابرایەك ئەبێ ناوی حاجی قادرە، ئەویش پیاوێکی بەساڵاچووە هیچ شوبهەیەکی لەسەر نی‌یە. هەروەها ئەوانیش هامشوی کەس ناکەن، بەڵام ماوەیەکە ئەفسەرێك لەروتبەی (رەئیس) دایە بەگەرم سەریان لێ ئەداو هەندێ لەگەڵ کوڕو کچەکەی علی افندی ئێواران ئەڕۆن بۆ دەرەوە. هەرچەندە ئەمەوێ ری‌و شوێنیان هەڵگرم بەڵام لەناو قەڵەباڵغی‌دا لێم ون ئەبێ نازانم بۆ کوێ ئەچن‌و چی ئەکەن.

نائل بە توڕەیی‌یەوە دەستێکی کێشا بە فایلەکەی بەردەمیاو نەڕاندی بەسەر کابرادا:

ئەی کەواتە بۆ هاتوی بۆلام خوا لەشت ساخ ئەکا.. چاودێری کردن واناب‌ێ. ئەی هیچ ئەبێ ناوی ئەفسەرەکەو تیپەکەی نازانی‌ی.

کابرا لەترسا ڕەنگی بوو بوو بەچاوی گازری‌و وەکو بینی ئاو ئەلەرزی‌و بە دەنگێکی لەراوە وتی:

-بەگم ئەمەیان ئەزانم.

خێرا دەفتەرێکی بچووکی لەبەر باخەڵی دەرهێناو پەڕەکانی هەڵدایەوە تا گەیشتە سەر پەڕەیەك وتی:

-ناوی رەئیس بەکرە لە فەوجی( - ) لوا ( - ) سریەی هەندەسە.

کە نائل گوێی لەمەبوو داچڵەکی‌و گورج سەیری فایلەکەی بەردەستی کرد. ئینجا سەری‌ی هەڵبڕیەوەو وتی:

-ئەبێ زۆر بەوردی ووریایی چاودێری ئەو ئەفسەرو کوڕو ئافرەتە بکەی. ئەیەڵی لێت ون بن.. هەرشتێکت لێ دین یا سەریان کرد بە هەر ماڵێکا ماڵەکە نیشانە بکەو لەنزیك ترین تەلەفونەوە قسەم لەگەڵ بکە، ئەگەر ئەم ئیشەت بەباشی بەجێ هێنا بەخشیشێکی‌باشت ئەدەمێ.. ئیتر برۆ بەلای ئیشی خۆتەوە.



که کابرا چوه دهری، نانیل ههستایه سهرپێ و کهوته هاتو چۆ کردن بهژورهکهدا. لهبهر خۆیهوه ئهی ووت:

-سهیری رێکهوت کـه. ئێستا استخباراتی مسپای فایلی ئهم ئهفسهرهیان بۆ ناردم بۆ ئهوهی بزانم لای ئێمه ناوی لهلیستهی شوبههلێکراوه کاندا ههیه یان نه. چونکه ئهوان لێی دوو دڵن. لهپاشا پی یهکی کێشا بهزهوی داو لهبهر خۆیهوه کهوتهوه قسه.

-ڕاوهسته بۆم فهرهاد.. ئهو جاره بههۆی باوکتهوه تهڵهیهکم بۆ نایتهوه بت گرم. بهڵام زوو لهفێکهی خۆت گهیشتیت بۆی دهرچوی. ئهم جاره بههۆی خوشکهکهت و ئهم ئهفسهرهوه که لام وابێ زاواته لهدهستم دهرناچی ئینجا ئهگهر جاری پێشو خۆت گرت لهژێر شوڵکی منداو گری ی دهمت ئهکرایهوه وه لهپاشا له بهندیخانه ههرات کرد، ئهم کهرهته یا ئهبێ لاشهکهت فڕێ بدهمه ئهم ڕووبارهوه یا ئهبێ پێ لهههموو شتی بنێی.

-٧-

ههندێ ئێواران ڕهئیس بهکرو گهلاوێژو نزار پێکهوه ئهچوون بۆ سینهما. لهوێشهوه ڕوویان ئهکرده باخێکی گشتی مارهیهک لهناو گوڵو گوڵزاردا رایان ئهبوارد لهپاشا ئهگهڕانهوه ماڵێ. ئێوارهیهک نزار سهری ئهیهشا ئهیتوانی لهماڵ بێته دهرێ. بهڵام ئهوان دوو بهدوو ڕۆیشتنه دهری، پاش تهواو بوونی سینهما لهباخچهیه لهسهر قهنهفهیهک لهتهنیشت یهکهوه دانیشتن. تیشکی مانگهشهوهکه ئهیدا لهقژه زهردهکانی گهلاوێژ ئهوهندهی تر پرشنگی ئهدایهوه. سرووهی بای شهمالیش جار جار خشه خشی بهگهڵای درهختهکان ئهخست، بۆنی عهتری شهوبۆی ئهدا بهلووتیانا، ئهمه یهکهم جار بوو کهههردووکیان بهتهنها دابنیشن. دڵی ههردووکیان خێرا خێرا لێی ئهدا بهجۆرێک ههستیان بهتهنگه ئهفهسی ئهکرد. ڕهئیس بهکر ههرچهندی ئهکرد ئهی ئهزانی چۆن

پهتی ئهم بێدهنگیه بچڕێ. لهوهو پێش بهئاواتی کاتێکی وا دهبوو کهلهگهڵ دهست گیرانهکهیدا بهتهنها دانیشتن ڕازی دڵی خۆی بو بگێڕێتهوه. شهو لهسهر جێگای ههزارهها قسهی ئاماده ئهکرد. دهریای ژیانی خێزانی دوا ڕۆژیانهوه لهههڵێکدا بۆی بگێڕێتهوه کهچی ئێستا ئهوهته ههلهکه ههڵکهوتوه بهڵام هیچ قسهیهکی بۆ نایه بهڵکو ههست ئهکا مێشکی لهکار کهوتوه وه لهتاوا تفی قوت ئهدایهوه، خۆزگهی ئهخواست نزاریان لهگهڵدا بوایه لهم تهنگو چهڵهمهیه ڕزگاری کا بهقسه ئهستهقه



خۆشهکانی. لهپاشا ههرچی چۆنێ بوو بهدهنگێکی لهڕاوهوه ووتی:

-گهلاریج

گهلاریج ئاووڕی لێ دایهوهو بهزهردهخهنهوه ووتی

-ههمدیسان گهلاریج؟ بڵێ گهلاوێژ..وێژ..وێژ.

ڕهئیس بهکر وهک و قوتابییهک لهبهردهمی مامۆستاکهیدا ڕاوهستابێ دهرسهکهی لهبیر چوبێتهوه بهتهریقییهکهوه ووتی:

گیانهکهم لێم ببووره بڵێم وێژ.. وی..وێژ. گهلاوێژ.

-ئهوهتا ورده ورده خهریکی فێر ئهی.

-بێگومان فێر ئهبم.. من ئهمهوێ جگه لهم ووشه خۆشهویسته زمانی کوردی فێربم، ئهو نهتهوه خهبات کهرهی سالههای ساڵه لهگهڵ نهتهوهی عهرهبدا خۆشی و ناخۆشی ئهچێژێ.. بهڕاستی خهوشه بۆ ئێمهی عهرهب زمانی برا کوردهکانمان ئهزانین که تهنیشت بهتهنیشتی یهکهوه ئهژین و لهخهباتی ڕزگاریدا ههردوولا وهکو یهک هاوبهشین.. ئهبێ ببی بهمامۆستام لهزمانی کوردیدا.

گهلاوێژ ووتی: ئهمه ههمووی تاوانی ئیمپریالیزم و کاربهدهسته چڵکاو خۆرهکانیهتی که ئهیان هێشتوه ئێوه فێری زمانی ئێمه ببن له ترسی ئهوهی ئهوهک لهیهک بگهین چونکه بهلهیهک گهیشتن یهک گرتن بههێز ئهبی و ڕووخانی ڕژێمی کۆنهپهرستی کهئهمهش مهترسی ههره گهورهی ئیمپریالیستهکانه. ڕاوهسته باسهرکهوین ئهوسا بزانه چۆن ههموو عهرهبێک فێری زمانی کوردی ئهبی.

پاش تۆزێک بێدهنگ بوون گهلاوێژ هاتهوه قسه:

-ئومێد ئهکهم قوتابیهکی زیرهک بی زوو فێریی زمانهکهمان ببی و ڕهئیس بهکر پاش ئهم گفتو گۆیه ئهختێک شهرمی شکاو دهستی گهلاوێژی خسته ناو دهستی یهوهو ووتی:

-ئهگهر بهردیش بم خۆشهویستی تۆ زیرهکم ئهکا.

-ئهوهنده منت خۆش ئهوێ؟

ڕهئیس بهکر ڕوومهتی لهڕوومهتی گهلاوێژ نزیک کردهوهو پێی ووت:

-ئەی گومانت لەمە هەیە؟ ئاخ خۆزگە ئەوەندە دەم ڕاست بوومایە ئەوەی لەدڵمایە بم توانیایە دەری برم.. ئەوسا ئەتزانی چەندم خۆش ئەوێی.

-پێی ناوێ هەمووی لە ڕوخسارتا دیارە.. بەڕاستی منیش خۆم زۆر بەبەختیار ئەزانم بەم خۆشەویستیە.. بەڵام خۆزگە..

-خۆزگە چی؟

-ئامانجەکەمان بەزوویەکی زوو ئەهاتە دیی و گەلەکەمان بەسەر بەخۆیی و سەربەستی تەواوی خۆی شاد ئەبوو وە فەرهادی کاکم بەسەربەستی وەکو ئێمە بەناو ئەم گوڵ و گوڵزارەدا ئەگەڕا.. موحاکەمەکەی فەرهادت نەبیستوە؟

-لەوەختی خۆیدا ڕۆژنامەکان بلاویان ئەکردەوە.

-ئەوەی لەڕۆژنامەکاندا نوسرابوو زۆری ناوەڕۆو یاکەم کرابوەوە. خۆزگە موحاکەمەکەیت ئەدی و چاوت پێی ئەکەوت بەچ ئازایەتیەك لەبەر دەمی حاکم دا قسەی ئەکرد. محکەمەی کردبوو بەشانۆیەك بۆ بەرگری لەبیرو باوەڕی خۆی و ئابڕو بردنی چینی کاربەدەستی خائن. تاوای لێهات حاکمەکە تووڕەبی و موحاکەمەکە بکا بەنهێنی.

ڕەئیس بەکر دەستی هێنا بەسەر شانی گەلاوێژدا پێی ووت:

-دوا ڕۆژ هەر بۆ گەلە.. ڕۆژێك ئەبێ لەبەر دادگای گەلدا ئەم خائنانە بەمل کەچی ڕاوەستن لەتاوانەکانیان بپرسینەوە.. گەل شانازی بەکاکەت و هەڤاڵە خەبات کەرەکانی تریەوە ئەکا کە قارەمانانە لەپێناوی ئازادی و سەربەخۆییدا تیێ دەکۆشن. کاکەت ئەو ڕۆڵەیەیە کە کاربەدەستان لەگەڵ ئەو هەموو هێزەیش کە لەبەردەستیانایە ئەترسن، وەکون بەکون بۆی ئەگەڕێن بیگرنەوە.

گەلاوێژ کە گوێی لەدوا ووشەی ڕەئیس بەکر بوو داچڵەکی و ووتی:

-بەڵێ کون بەکون بی ئەگەڕێن، بەڵام انشاالله قەت بەم مرازە ناگەن. گەل داویان بۆ ناوەتەوە.. جارێکیان نائیل بەقسەی لووس باوکە ساکارەکەی تەفرەدابوو ئەگەر فەرهاد خۆی بدا بەدەستەوە بەرەڵای ئەکاو هیچی لێ ناکا. باوکی بەستەزمانیش بەهەڵە داوان ئەچێ بۆ ئەو جێگایەی کە فەرهاد خۆی لێ شاردبوەوە ئازانێ نائیل چاوێکی شوێن خستوە لەپشتی‌یەوە دوور بەدووری ئەڕوا بۆ ئەوەی ماڵەکە نیشانە بکاو لەپڕ بدەن بەسەریاو بیگرن چونکە نائیل سوور بوو کە فەرهاد لەوانە نیە کە خۆی بدا بەدەستەوە. کە باوکم چوە ژوورێ و لەم لایەنەوە قسەی لەگەڵ فەرهاد کرد. فەرهاد گورج زانی باوکم کراوە بەتەڵە ئەوی پێ بگرن دەست بەجێ بەسەر باندا سەرکەوت و بازی دایە ماڵەکەی دراوسێیان، وە لەوێوە بۆی دەرچوو. پاش تۆزێك خێڵی تەحقیقات دای بەسەر ماڵەکەدا بەڵام بەنا ئومێدی گەڕانەوە دواوە، ئیتر لەوساوە ئازانێ فەرهاد لەکوێ خۆی‌شاردۆتەوە. هەر ئەوەندە ئەبێ جارو بارە بەهۆی پیرەژنێکەوە هەواڵی خۆیمان بۆ ئەنێرێ.

-کەواتە بەهۆی ئەو پیرەژنەوە دەنگی ئێمەی ئەفسەرە ئازادی خوازەکان ئەگەیەنێی بەکاکت.

-بەڵێ، چاك بوو بیرم کەوتەوە..

دەستی کرد بەگیرفانی کراسەکەی داو قاقەزێکی بچووکی دەرهێناو، ووتی:

-ئەم قاقەزەشی بۆ ناردوون.

ڕەئیس بەکر گورج قاقەزەکەی لەدەست سەندوو ئاخنیی بەگیرفانی پانتۆڵەکەیدا. ئینجا باوەشی کرد بەگەلاوێژداو دەمی نا بەدەمیەوە. پاش تۆزێك گەلاوێژ خۆی ڕاپسکان و ئەختێ لێی دوورکەوتەوە. هەردووکیان هەناسەیان لێ سوار بووبوو، ڕەنگیان سوور هەڵ گەڕابوو، چاویان پرشنگی ئەدایەوە.. پاش تۆزێك بێ دەنگ بوون و گەلاوێژ ووتی:

-کات درەنگە تا تەکسی ماوە هەستە بابڕۆینەوە.

کە هەستان بڕۆن گوێیان لەخشپەیەك بو لەناو درەختەکانەوە. کە ئاوڕیان دایەوە چاویان بەکابرایەکی خڕپلانە کەوت بەپێ دزکێ بەرەو دەرگای باخەکە ئەڕوا. گەلاوێژ قۆڵی ڕەئیس بەکری گرتو بەچرپە پێی ووت:

-وا بزانم ئەم کابرایە خۆی لێ گرتبووین.

ڕەئیس بەکر زۆر بەووردی سەرنجی دایە کابراو لەپاشا شانێکی هەڵ تەکاندو ووتی:

-هیچ نیە با خەو هەموو کەسێك ڕوی تێ ئەکا..سەیری ئەو دوو پیاوەش کە لەولاوە بۆ خۆیان یەن و ئەچن.

کە ڕەئیس بەکرو گەلاوێژ لەباخەکە هاتنە دەرێ، کابراکە لەوپەڕی شەقامەکە ڕاوەستابوو لە جگەرە فرۆشی جگەرەی ئەکڕی و بەتیلایەکی چاویش هەر سەیری باخەکەی ئەکرد. کەزانی هەردووکیان هاتنە دەرێ وسواری تەکسی بوون، گورج دەفتەرە بچووکەکەی لەباخەڵی دەرهێناو شتێکی تیا نووسی. لەپاشا خۆی گەیاندە دەرمان خانەیەك نزیك بەو ئاوچەیە، بێ ئەوەی ڕوخسەت لە خاوەن دەرمانخانەکە بخوازێ تەلەفونەکەی هەڵگرتو خستیە سەر ژمارەیەك و بەدەنگێکی نزم چەند قسەیەکی کرد. ئینجا بەخێرایی لەدەرمان خانەکە هاتە دەرێ و لەناو خەڵکەکەدا وون بوو.

ڕەئیس بەکرو گەلاوێژ کە گەیشتە بەردەرگای ماڵەوەو لەتەکسیەکە دابەزین، هەرچوار دەوریان بە پۆلیس گیرا. گەلاوێژ ڕەنگی‌بزرکاو قۆڵی ڕەئیس بەکری گوشی.. ڕەئیس بەکر لێیان هاتە پێشەوەو ووتی:

-چیتان ئەوێ؟

کابرایەکیان تیا بوو بەرگی سویلی لەبەردا بوو بەمونێکەوە ووتی:

-تۆ جارێ لە جێگای خۆت مەبزوو، ئاوەڵن بی‌پشکنن.

ئەوەندە بەپشکنینەوە خەریك ئەبوون کە پارچە قاقەزەکەیان لەگیرفانی پانتۆڵەکەی دەرهێناو کە گەلاوێژ لە باخەکە پابوویە. کابرای سویل لەبەرەکە سەیرێکی قاقازەکەی کرد رووخساری ڕوون بوەوە ئەت ووت هەنگی لەدارا دۆزیوەتەوە. ڕوی کردە ڕەئیس بەکرو ووتی:

ها بزانم بەشفرە نوسراوە.. پاش تۆزێکی کە خۆت بۆمان ئەخوێنیتەوە.. جارێ با بڕۆین ماڵێ هەردوکتان بپشکنین بزانین چی تر ئەدۆزینەوە..

لەدەنگە دەنگی ئەم هەرایە علی افندی لەگەڵ حاجی قادر کەهێشتا ئەڕۆیشتبوەوە، وە نزار هاتە دەرێ، کەچاویان بەم دیمەنە کەوت هەموو لەجێی خۆیان ووشك بوون. علی افندی بەپەشۆکاویەوە ورگی هێنایە پێشەوەو بەدەنگێکی تێکەڵ و پێکەڵ ووتی:

-ئەوە چیە؟ ئەوە چیە گەلاوێژ؟!

کابرای سویل لەبەر پاڵێکی پێوە ناو وتیی:

-بابچینە ژورەوە هەموو شتێ تێ ئەگەی.

پاش ئەوەی لەپشکنینی ماڵی علی افندی بوونەوە هیچیان ئەدۆزیەوە، دەستیان کرد بە پشکنینی ماڵی ڕەئیس بەکر لەوێش هیچیان دەست گیر ئەبو. لەپاشا سویل لەبەرەکە ووتی:

-دەی سواربن بۆ تەحقیقات

لەناو زاڵەو زریکی منداڵ و ئافرەتا بەکرو گەلاوێژ کەلەپچە کران و ئاخنرانە بەناو جێبێکی پۆلیسدا کە لەو نزیکانە ڕشاوەستابوو.

علی افندی زۆر پەرێشان بوو. هەر ئەیکێشا بەوورگی خۆی یاو ئەی ووت.

-باشە حاجی.. باشە.. قسەی ئەو شەوەمت لەبیرە.. قسەی من وەکوو ئەخشی بەرد وایە..وا ئەمیشیان برد کچەکەشیان بردم..



بەم سەرو ئەوسەری کۆلانەکەدا ئەهات و ئەچو، ئەمێنێک سەدارەکەی دائەکەنو دەمێکی کەش ئەی کردەوە سەری‌ی. خەڵکی گەڕەکەکە هەموو لێی کۆ بووبوونەوە دڵ خۆشیان ئەدایەوە، بەڵام علی افندی زیاتر ئارامی لێ هەڵ ئەگیرا. حاجیش واقی وڕما بوو ئەی ئەزانی بڵێ چی لەپاشا علی افندی ووتی:

-من ئیمشەو شێت ئەبم.. ئەبێ بڕۆم.. ئەڕۆم بۆ تەحقیقات بزانم چی‌یان لێ ئەکەن حاجی و خەڵکەکە هەرچەندە ویستیان دای مرکێنــەوە بێ‌سوود بوو. ئاچار حاجی پێ‌ی‌ووت.

-باشە منیش یەم لەگەڵتا.

نزاریش خەریک بوو بچێ لەگەڵیان بەڵام بارکی نەیهێشت. کە لەبەر تـەحقیقات لەتاکسیەکە دابەزین هەرچەندە پاڕانەوە پاسەوانەکان ئەیان هێشت بچنە ژووری. علی افندی ئاچار بوو لەسـەر تاقەکـەی بـەر دەرگـای تـەحقیقات دابنیشێ و سوێند بخوات تابەیانی لەو جێگایە نەبزوێ بەڵام حاجی قادر پاش هـەوڵێکی زۆر پەشـیمانی کـردەوەو بەجووتـە بـەرەو مـاڵ گەڕانـەوە بەتـەمای ئـەوەی بـەیانی بێنـەوە بـۆ تەحقیقات.

-٨-

ئانیل بەرنیوە شەوە لەژوورەکـەی خـۆی‌دا بەپێوە ڕاوەستابوو. ڕووی کردبووە پەنجەرەکە سەیری ڕووباری دیجلـەی ئـەکرد. گـوێ‌ی لـە جیڕەی دەرگاکەبوو، کە ئاوڕی دایەوە ووتی:

-ها خەزعەل هێناتان؟

-بەڵێ بەگم

-بیان هێنەرە ژووری.

ئانیل لەسەر کورسیەکەی خۆی دانیشتەوە ئەوەندەی پی ئەچوو رەنیس بەکرو گەلاوێژ هێنرانە ژووری. ئـانیل پـاش ئـەوەی تـۆزێ بەڕوویـەکی گرژەوە پیایا هەڵ ڕوانی ووتی:

-وەرنە پێشەوە. تۆ. هـەی بەلەعنـەت بی. لای خۆی ئەفسەری سوێندت خـواردوە دڵ سـۆزیی بـۆ شـارو نیشـتمان کـەچی دەسـتت لەگـەڵ گێرەشێوێنەکان تێکەڵ کـردوە خـەریکی دژی شا پیلان ڕێك ئەخەی. هەی سەرسەری.

رەنیس بەکر لەم قسانە دەماری گرژ بوو. لەتاوا لێوی خۆی ئەکرۆشت بـەڵام قسـەی لـەدەم ئەهاتـە دەرێ. لەپاشـا ئـانیل ڕوی کـردە گـەلاوێژو بەتەنزێکەوە پێ ووت:

-ئەی تۆ خانم؟ تۆش چویتەوە سەر فەرهادی برات؟ پێـم ئـاڵێ‌ی پـەیوەندیت چیـە لەگـەڵ ئـەم ئەفسەرەدا؟ بەو شەوە لەرباخە چیتان ئەکرد.

گـەلاوێژ ڕەنگـی سـوور هـەڵ گـەڕا بـەڵام هیـچ وەڵامێکی ئەدایەوە. ئانیل هەمدیسان لێی پرسیەوە

-فەرهادی برات لەکوێ‌یە؟

-نـازانم زۆر دەمێکـە ئـەمان دیـوەو هـەواڵی نازانین.

-ئەم درۆو دەلەسانە لەگەڵ من سەرناگرێ. من ئانیلم ئانیل ڕەنگە ناوبانگتـان بیسـتبم. ئـەی ئـەم قاقـەزە چی‌یـە کەلەباخەکـەدا داتـە دەسـت ئـەم ئەفسەرە؟ لەفەرهادەوە بۆت هێناوە؟



-نازانم

-ماها نازانم ڕەحمەتی گیانم. بەلام بەمەڵە چون ڕەحـەتی گیانتـان لەزانینتانەوەیـە. قسـە بکـەن باشترە.

ئینجا ڕوی کردەوە رەنیس بەکرو ووتی:

-ئەم قاقەزە بۆتۆ هاتوە ئەبێ شفرەکەی بزانی

-هیچی لێ نازانم، وەبۆ منیش ئەهاتوەو نازانم چۆن کەوتۆتە گیرفانم. ئانیل هەڵسایە سەرپێ و لێیان نزیکتر بوەوە، وەبەدەنگێکی گڕ پێ‌ی ووتن:

-من هەرچەندە لەگەڵ خەڵکی لاسارو بێ گوێدا زۆر دڵ ڕەق و بی بەزەییم بەڵام لەگەڵ پیاوی گـوێ ڕایەڵ و ژیر کەلەدا زۆر دڵ نەرمو لەسەر خـۆم. تـا پێـم بکـرێ یارمـەتی‌یان ئـەدەم، وە لـەو تاوانانـەی کردووتانە بەبێ سزا رزگارتان ئەکەم هەر بەمەرجێ چی ئەزانن پێم بڵێن. هیچم لێ نەشارنەوە. ئێوەش ئەگەر پی لەهەموو شتێك بنێن بەڕاستو ڕەوانـی، بەڵێن تان ئەدەمێ رزگارتان بکەم لەو سزا گەورەیەی چاوەڕێ تان ئەکا. من شتێکی ئەوەندە گەورەتان لێ داواناکەم هەر ئەوەندە ئەبێ جێگـای فـەرهادم پـی بڵێـن وە شـفرەی ئـەم قاقـەزەم بـۆ بکەنـەوە لەپاشا نـاوی ئـەو کەسـانەم پـێ بڵێـن کـە پـەیوەندییتان پی‌یانەوە هەیە. خۆ ئێوە هەر ئەبێ قسە بکەن جا بەخۆشـی خۆتان قسـە بکـەن باشترە لـەوەی لـەژێر ئازاردا قسە بکـەن چونکـە ئەوسـا پـێ لێ ئـانیش ناکەوێتـە فریادتان. ها ئەوە قاقەزوو قەڵـەم لەسـەر ئەو دوو کورسیە دانیشن چی ئەزانن بینووسن.

گەلاوێژ ورەنیس بەکر هەردووکیان بەیەك دەنگ ووتیان.

-ئێمە هیچ نازانین لەبەر ئەوە هیچ ناتوسین.

ئانل لەم لاساریەیان ئەختێ دەماری گرژ بوو، وە بەدەنگێکی بەرز ووتی:

-من زۆر لـە گەڵتان یەمە خـوارێ. باتـا سـبەی شەو مونەتتان بێ. باش بیر لـەو دوا ڕۆژە ڕەشە بکەنەوە کە چاوڕێتان ئەکا ئەگەر قسە ئەکەن.

لەپاشا ئـانیل دەستی نا بەزڕی سەر مێزەکـەی دار بەپۆلیسەکەی ووت کە هاتە ژوورەوە:

-بیان بە

هەردووکیان خرانە ئەو ژوورەی لەسەر لەوحەی دەرگاکەی نووسرابوو (ژووری ئێشك گرەکان)، وە دەرگاکەیان لەسـەر داخـرا. کەهـەردووکیان دوو بەدوو مانەوە رەنیـس بـەکر بـە گـەلاوێژی ووت:

-ئانیل دڕندەیەکە لەپێستی مرۆڤدایە، هەرەها زۆر فێڵ بازیشە، ئەبێ زۆر ئاگامان لـە خۆمـان بێ. ئەگەر لەت و پەت کرێین نابـێ قسـەمان لـەدەم بێتە دەرێ. ئەبێ ئەوە بزانین بە ووشەیە لە دەمی ئێمـە بێتـە دەرێ زیـانێکی گـەورە ئەگەیـەنێ بەمەسـەلەی رزگاری گەلەکەمان، وە لە پاشا زۆر لە نیشتمان پەروەرەکان بەدەستی ئەم خوێن ڕێژانە لە ناو ئـەچن. با ئێمـەیش بچینـە نـاو قافڵـەی شـەهیدانەوە لـە پێنـاوی رزگـاری گەلەکـەماندا.

گەلاوێژ بەزەردە خەنەیەکەوە دەستی رەنیس بەکری گوشی و ووتی:

-تۆ هەر ئازاردانت لە ڕێگادایە، بەلام من جگە لـەئازاردان لەوانەیـە ئـەم دڕندانـە دەسـت بـەرن بـۆ ناموسـم، خـۆم ئـەزانم ئـەو کابرایـەی ئـانیل بەخەزعەل ناوی هێنا بە چ چاوێکی پیسەوە سەیری

نەکردم. بەڵام هەموو خوداناندێك لە ڕێگای ئازادیدا هەرزانە

ڕەئیس بەکر کە گەلاوێژ باسی (ناموسی) هێنایە پێشەوە ڕوخساری کرژ بوو.هەموو لەشی هاتە لەرزین لەپاشا مستەکۆڵەیەکی کێشا بەزەویدا ووتی:

-من ئەزانم هەموو کردەوەیەکی پیسیان لێ نەوەشێتەوە ئەم جانەوەرانە بەهەموو توانایەکیانەوە ئەیانەوێ سەر بەنیشتمان پەروەرەکان شۆڕ بکەن. بەڵام هەر خۆیان سەر شۆڕن، قەت خەیاڵ نەکەی ئەمانە هەرچیت لێ بکەن بتوانن ناموست بشکێنن. بەڵکو لای گەل زیاتر پیرۆزو بێگەرد ئەبی، وەلای من خۆشەویست تر ئەبی.ی لەپاشا هەردووکیان بەتەنیشت یەکەوە ڕاکشان هەریەکەیان کەوتە دەریای خەیاڵی خۆیەوە. ڕەئیس بەکر شێوە خۆشەویستەکەی پێشەوای هاتەوە پێش چاو کە لەکۆبوونەوەی دواییاندا لەماڵی عەقید عبداللە قسەی بۆ ئەکردن و مژدەی نزیك بوونەوەی ڕۆژی ئازادی ئەدانێ.

لەدڵی خۆیدا ووتی: تۆ بڵێی پێشەواو هەڤاڵەکانم زانیبێتیان ئێمە گیراوین، تۆ بڵێی ختوورە بەدڵیانا بێ ئێمە نهێنی بزوتنەوەکەمان و ناویان لای دوژمن بدرکێنین. لەم خەیاڵانەدا بوو کە وورده ووردە خەو بردیەوە.

ئەو بەیانیە کەس لێی نەپرسینەوە. شەو داهات، کات گەیشتە (١٢)ی نیوە شەو هەردووکیان بەتەنیشت یەکەوە ڕاکشابوون هێشتا خەو نەچووبووە چاویان گوێیان لەزرەی ئەڵقە ڕێزی دەرگابوو لەپاشا دەرگاکە کرایەوە. هەردووکیان خەریك بوون هەستن کە کابرا ڕەشە درێژەکەی نائیل پێی ئەوت (خەزعەل) هاتە ژوورەوەو بەرەئیس بەکری ووت:

-بابڕۆین

ڕەئیس بەکر چاوێکی لەگەلاوێژ داگرت و پێش خەزعەل کەوت و ڕۆی.

نائیل بەژوورەکەی خۆیدا ئەهات و ئەچو کە ڕەئیس بەکرو خەزعەل لەبەردەمیا ڕاوەستان. پاش ئەوەی نائیل ئەختێ بەرەئیس بەکریا هەڵ ڕوانی پێی ووت:

-ها چۆنیت؟ ئێستا ئەڵێی چی؟

-هەر ئەوەبوو دوێنێ شەو پێم ووتی، هیچ قسەیەکم نیە بیکەم. نائیل بەتووڕەییەوە ڕووی کردە خەزعەل و پێی ووت:

-بیبە خۆت ئەزانی‌ی گرێی دەمی چۆن ئەکەیتەوە.

خەزعەل پەلی ڕەئیس بەکری گرت و لەگەڵ پۆلیسێکی تردا لەبەردەرگای یەکێ لەو سێ ژوورەدا ڕاوەستان کە لەتەنیشت ژوورەکەی نائیلەوە بوو. پۆلیسە کە سویچی سەر دەرگاکەی کردەوە، لەپاشا ڕەئیس بەکریان بەسێ پێ پلیکانەدا بردە خوارێ ژوورێکی تەسك و قوڵ و تاوەزێ بوو. تەنها کونێکی بچووکی بەرزی تیابوو. بەهەر چوار دیواری ژوورەکەدا کەلەبچەو زنجیرو حەیزەران و شتی تری وەکو ئەمانەی تیا هەڵواسرابو بەبنمیچەکەشیەوە زنجیرێك شۆڕ بوو بووەوە گلۆپێکی تیشك کەم ژوورەکەی ڕووناك ئەکردەوە کە گەیشتنە ناوەڕاستی ژوورەکە خەزعەل بەفیزێکەوە بەرەئیس بەکری ووت:

-لە لاساری خۆت وەرە خوارێ بەقسەی نائیل بەگ بکەی باشترە، چاوت لێ بێ: ئەمە هی نینۆك دەرهێنانە، ئەمە فەلاقەیە، ئەمە خەڵکی پێ هەڵئەواسین، بەمە ئەدرێی لە کارەبا وە گەلێ شتی تریشمان هەیە هەر چاوت پێیان بکەوێ زمندەقت لێ یان ئەچێ. ڕزگار بوونت بۆ نیە یا ئەبی قسە بکەی یا ئەبی بمری، کەمردیشی لاشەکەت ئەخەینە بیرەوە.

لەقوژبنێکی ژوورەکەدا لەوحێك دانرابوو، خەزعەل هەڵی بڕی و ووتی:

-سەیر کە.

ڕەئیس بەکر چاوی بەبیرێکی قووڵ کەوت هاژە هاژی ئاوی لێ ئەهات، تێگەیشت کە ئەمبیرە ئەچێتەوە سەرووباری دیجلە ئێچیرەکانی ئەم درندانە کە لەژێر ئازاردا ئەمرن فڕێ ئەدرێنە ئەم بیرەوە.

لەپاشا خەزعەل ڕووی تێ کردوو ووتی:

-دیارە ئەرم بووی

-هیچ نازانم

کەوابێ خۆت ڕووت کەرەوە ئێستا چاوت بە ڕۆژی خۆت ئەکەوێ، هەموو جلەکانی پێ داکەن دەرپێکەی نەبێ. لەپاشا کورسیەکی بۆ داناو پێی ووت بچێتە سەری، ئینجا هەردوو مەچەکی پێکەوە خستە کەلەبچەکەوە بەزنجیری بن میچەکەوە بەستیەوە، وە شەقێکی لە کورسیەکەی ژێر پێی هەڵدا. کە ڕەئیس بەکر بەبن میچەکەوە هەڵواسرا خەزعەل پاڵێکی پێوە نا وەکو دیلانێ کەوتە هاتو چۆ بەئاسمانەوە.

خەزعەل بەزەردەخەنەیەکەوە پێی ووت:

-بەکەیف کە بۆ خۆت. جارێ ئەمە یەکەم هەنگاوە.

ڕەئیس بەکر هەستی بەئازارێکی نێجگار گەورە ئەکرد. وای ئەزانی هاکا هەردو قولی لەبنا ئەپچڕان. خەزعەل دەرگای لێ داخست و بەم ڕەنگە بەجێی هێشت. پاش چارەکە سەعاتێ هاتەوە لایو پێی ووت:

-ئەڵێی چی؟ قسە ناکەی

ڕەئیس بەکر هیچ وەڵامی نەدایەوە. ئەم بێ دەنگیەی خەزعەل زۆر تووڕە کرد، حەیزەرانێکی لەسنگەکە کردەوەو کەوتە دار کاری کردنی ڕەئیس بەکر لەتاو ئازار لێوی خۆی ئەکرۆشت بەڵام ئۆفی لەدەم ئەهاتە دەرێ. بەم خۆ گرتنەی خەزعەل نێجگار قینی هەستا بەهێز تر گوڕی حەیزەرانی لێ ئەبەستەوە لەپاشا ڕەئیس بەکر وورده ووردە دنیای لەبەرچاو تاریك بوو، ئەوەندەی پێ نەچوو ئاگای لەخۆی نەما.

-٩-

نیوەڕۆ بوو، گڕی گەرمای مانگی گەلاوێژ پیاوی ڕەڕس ئەکرد. زەعیم عبدول کەریم لە (منصور) لەنیشتەجێی سپایی لەژوورەکەی خۆیدا لەگەڵ مقدم ڕۆستم کەتازە گۆڕابوو بۆ ئەوەی دانیشتبوو مقەدەم ڕۆستم ڕۆژنامەیەکی (البلاد)ی بەدەستەوە بوو ئەیخوێندەوە، لەپاشا ڕۆژنامەکەی داناو ووتی:

-بەقسەی ئەم ڕۆژنامەیە بێ ئەبێ ئەمڕۆ نووری سەعیدو عەبدول ئیلاه گەڕابنەوە بۆ بەغدا.

-بەڵێ هاتونەتەوە بۆ ئەوەی بەیانی شاو نووری سەعید بچن بۆ ئەنقەرە بۆ کۆبوونەوەی پەیمانی بەغا

-دیارە بڕیاریان داوە بەم نزیکانە دەستی خۆیان لەسوریە بوەشێنن.

-نەك هەر لە سووریە بەڵکو لەلبنانیش

لەم کاتەدا سەربازێك هاتە ژوورەوەو پاش سڵاو کردن بروسکەیەکی دایە دەست زەعیم عەبدول کەریم و سڵاوی کردەوەو ڕۆیشتە دەرێ عەبدول کەریم بەپەلە بروسکەکەی کردەوە. پاش ئەوەی خوێندیەوە بەناو چەوان گرژیەکەوە دایە دەست مقەدەم ڕۆستەم ئەمیش کە لەخوێندنەوەی بووەوە ووتی:

-ئەمە مانای چیە؟

عەبدول کەریم لەم کاتەدا لەبەر پەنجەرەکەدا ڕاوەستابوو دەستێکی لەگیرفانی پانتۆڵەکەیدا بوو.



بەدەستەکەی کەشی پەنجەرەکەی ئەکردەوە کە گوێی لەم پرسیارەبوو ئاوڕی دایەوەو ووتی:

-مانای ئەوەیە، هەروەکو خۆت ئێستا ووتت، ئەیانەوێ زۆر بەگورجی دەستی خۆیان بوەشێنن. لیواکەمان ئەبێ نیم شەو لەنیوە شەودا بەرەو ئەردەن بکشێ بێگومان ئەمە بۆ چەواشە کردنە، ڕاستیەکەی ئەوەیە ئەمان ئێرنە سەر لبنان و سوریە.

-باشە ئێستا چار چی‌یە؟ ئێمە چۆن ئەبێ ئەم تاوانە گەورەیە بکەین؟

عەبدول کەریم بەزەردەخەنەیەکەوە لەسەر خۆ ووتی:

-ئێمە نابێ قەت ئەم تاوانە بکەین، دەستی دایە تەلەفوون و لەگەڵ سەرۆکی ئەرکانی جەنگ چەند قسەیەکی کردو تەلەفۆنەکەی دانایەوە مقەدەم ڕۆستەم بەسەر سامی‌یەکەوە لێی پرسی

-چی‌یە؟ ئەچین بۆ بەغداد؟

-بەڵێ، بەبۆنەی ئەوەی نیم شەو ئەڕۆین بۆ ئەردەن داوام لێ کرد ڕێگامان بدا ئێستا بچین بۆ بەغدا بۆ ئەوەی سەری کەس و کارمان بدەین و کەلو پەل خۆمان کۆ بکەینەوە وە ئێوارە بگەڕێینەوە بۆ ئێرە، مەبەستم لەچوونە بەغدایە چاومان بەبرادەرەکانمان بکەوێ هەل لەمە باشتر نابێ با ئێمە لەپێش دا دەستی خۆمان بوەشێنین. هەستە ئوتومبیلەکەم لە گەراج بهێنینە دەرێ بڕۆین.

لای ئێوارە کە بەرەو (مەنصور) ئەگەڕانەوە، مقەدەم ڕۆستەم. ئوتومبیلەکەی لێ ئەخوڕی هەستی کرد کە زەعیم لە خەیاڵێکی قووڵ دایە، پاش ئەوە لە(مەنصور) نزیک بوونەوە لێی پرسی :

-بزانم بیرت ئێجگار خەریکە، ئایا دوودڵی لەسەر کەوتنی بزوتنەوەکەمان ؟

-نەء بەڵام لەمەسەلەی گرتنی ڕەئیس بەکرو گەلاوێژ نەختێك دڵم لەمەراقدایە. دوێنێ شەو گیراون، ئەترسم هەر دوێنێ شەو یا ئیمشەو ئازار بدرێن و خۆیان ئەگرن قسە بدرکێنن ئەوسا خۆت ئەزانی چی ڕوونەدا. من لەڕۆحی خۆم ناترسم، ئەترسم بزوتنەوەکەمان ئاشکرا بێ و سەرنەگرێ.

-جاری گەلاوێژ کەسمان ناناسێ و لەبزوتنەوەکەشمان نازانێ هەر ئەوەندە هەیە ڕابەر بووە لەنێوانی ئێمەو بەرەی یەك گرتوی نیشتمانی‌دا بەهۆی ڕەئیس بەکرەوە. وەلەدەربارەی ڕەئیس بەکریشەوە بڕوامکە قیمە قیمەیش بکرێ قسە بکا.

-من ناڵێم قسە ئەکا یا نای‌کا بەڵام ئەبێ بۆ هەموو شتێ وریا بین تا پێمان ئەکرێ زووتر بجوڵێین بۆ ئەوەی لەسەعات (٥)ی پاش نیوە شەودا هەموو شتێ بیڕێتەوە.

-١٠-

شەوی (١٤)ی گەلاوێژ لە باخەکەی کۆشکی (رحاب) بەهەزارەها گلۆپی ڕەنگاو ڕەنگ ڕازابووەوە.



لەهەموو گۆشەیەکیا مێز دانرابوو لەهەموو بابەتە خواردنەوەو خواردنی لەسەر ڕیز کرابوو لەدەوری هەر مێزە چەند وەزیرێك یا چەند کاربەدەستێکی گەورە کۆ ببوونەوە پێکیان نۆش ئەکرد. لەناوەڕاستی باخەکەشدا تیاترۆیەك لەسەر سەمتی ئاوازی مۆسیقای ڕۆژئاوایی سەمای ئەکرد. لەنزیکیشەوە مێزێکی گەورە دانرابوو عەبدول ئیلاه فەیصەڵ و نوری سەعید لەدەوری دانیشتبوون سەیری تیا ترۆکەیان ئەکردو چەپڵەیان بۆ لێ ئەدا. ئەم ئاهەنگە بەبۆنەی ئەوەوە بوو سبەینێ شاو نوری سەعید ئەچوون بۆ ئەنقەرە بۆ کۆبوونەوەی پەیمانی بەغدا.

عەبدول ئیلاه دانەوی‌یەوە سەگێکی سپی تیسکن لەبەر پێی‌دا ڕاکشابوو هەڵی گرت و خستیە باوەشی دەستی بەسەر پشتیا ئەهێنا کەبەنوری سەعیدی ووت:

-تاقیم کردۆتەوە هەر کەنیشێکمان بەدەستەوە نەبێ دەست بهێنم بەسەر پشتی ئەم سەگەدا سەرئەکەوین.

نوری سەعید بەزەردەخەنەیەکەوە لێی پرسی:

-ئەمە ئەو سەگە نەبێ کە بە(٧٠٠) دینار لە ئەمریکاوە بۆت هاتووە؟

-بەڵێ ئەوەیە ، بەخوا بەهەموو گەل عێراقی ناگۆڕمەوە.

عەبدول ئیلاه پێکەکەی هەڵگرت و ووتی :

-نۆش کەن بەبۆنەی کۆبوونەوەی سبەینێمانەوە لەئەنقەرە پاش ئەوەی هەرسێکیان قومیان لەپێکەکەیان دا، دیسانەوە عەبدول ئیلاە ڕوی کردە نوری سەعیدو لێی پرسی.

-تۆ بڵێی ئەم کۆبوونەوەیە کۆتایی بەم مەسەلەیە بهێنێ..بزانە لەکەیەکەوە ئەمە درێژە ئەکێشێ.. هەمووی خەتای ئەمریکایە.. هەر ڕۆژە لەسەر پەلپو بیانۆرییەکە.

نوری سەعید چاوێکی بڕیە تیاترۆکە کە لەوساتەدا لەگەڵ فاضل جمال سەمایان ئەکرد ئینجا ووتی :

-دڵت مەراق نەکا ئەم جارە هەموو شتێك بڕاوەتەوە هەر ئەوەندەی ماوە لەئەنقەرە بۆ دواجار چاوێ بخشێنینەوە بە پیلانەکەدا بۆئەوەی هیچ کەلەبەرێکی تیا نەبێ سەر نەکەوتنی لەدوابێ. ئیمڕۆش لەگەڵ بالیۆزی ئەمریکا قسەم کردەوەو تێی گەیاندم کە ئەمجارە ئەمریکا سوورە لەسەر جێ بەجێ کردنی داخوازیەکەتان.

فەیصەل ئەوەندەی خواردبوەوە زمانی گۆی نەئەکرد کە هەڵی دایە.

-ئیمشەو لیوای بیستەم ئەڕوا بۆ ئەردەن؟ نوری سەعید سەیری سەعاتەکەی کردو ووتی :

بەڵێ، ئیستا ئەبێ کەوتبێتە بزووتن.

-عەبدول ئیلاه دەستێکیدا بە پشتی فەیصەل دار ووتی:

-لە ئەنقەرە تا هەموو شتێك ئەبڕێتەوە خۆت بەئافرەتە تورکەکانەوە خەریك ئەکەی، مەسەلەکە زۆر گرنگە ئەبێ باش وریا بی‌ی عەبدول ئیلاه هێشتا لەقسەکەی ئەبووبوەوە کە فەیصەل دەستار دەستی خستە سەر سەری تیاترۆکەر کەوتە سووڕدان لەگەڵ یا. لەهەموو لایەك چەپڵە ڕێزان دەست پێ کرا، هاوار بەرز بوەوە بەژیانی شا لە پاشا کەماندوو بوو، بەعەناسە سواری‌ی لەجێگای خۆی دانیشتەوە، عەبدول ئیلاه بەزەردەخەنەیەکەوە پێ‌ی ووت:

-ماشاالله باش فێری سوڕران بووی

نوری سەعید سەیری سەعاتەکەی کردو ووتی :

-وا سەعات یەکی پاش نیوە شەوە بەیانی ئەبێ زوو هەڵسین لە خەو خواتان لەگەڵ

دوا بەدوای نوری سەعید میوانەکانی کەش هەموو ڕۆیشتن.

کۆشکی (رحاب) خامۆش بوو لەتەقی تەقی پێلاوەکانی یاساوڵەکان ئەبێ هیچ دەنگێکی کەی لێوە نەئەهات.

-١١-

بەیانی تاریك‌و ڕوون بوو کە رەئیس بەکر ئەختێ هۆشی هاتەوە بەر چاوی کردەوە بینی بەبەتانیەك پێچراوەتەوەو گەلاوێژ بەدیاریەوە دانیشتوە فرمێسك لەچاوەکانیا قەتیس بوەوەوپیایا هەڵ ئەڕوانی خەریك بوو بجوڵێتەوە بەڵام هەستی کرد هەموو لەشی وەکو ژێلەمۆی پیاکرابێ وایە لەتاوا ووتی ئۆف.

-گەلاوێژ کە گوێ‌ی لەم ئۆفە بوو وەچاوی بەچاوەکانی کەوت نایان تروکێنێ، ئەختێ بەتانیەکەی لەسەر هەڵدایەوەو ناوچەوانی کە هەمووی خەڵتانی خوێن بوو ماچی کردوو لێ‌ی پرسی.

-بەساقەت بم وادیارە ئازارت زۆرە

-ئێجگار زۆرە، بەڵام قەی ناکە دڵی دوژمنم خۆش ئەکردووەو هەرچەندیان کرد تەنانەت ئەیانتوانی هاوارێکیش لەدەمم بهێننە دەرێ. گەلاوێژ لەشەربە شکاوەکەی کە لەتەنیشتیەوە بوو دەستە سڕەکەی تەڕ کردو خوێنە مەیوەکەی لەدەم‌و چاوی رەئیس بەکر سڕیەوە. وە کە بەتانیەکەی لەسەر لابرد سەیری کرد هەرچی لەشی هەیە بڵقی کردوەو شین داگەڕاوە.

رەئیس بەکر بەدەنگێکی نزم لێی پرسی:

-کەی منیان هێنایەوە بۆ ئێرە؟

-نازانم ، شەو زۆر درەنگ بوو، بەدوو پۆلیس هەڵیان گرتبووی. کە بەم ڕەنگە چاوم پێت کەوت وام زانی گیانت لەبەرا ئەماوە. قیژانم بەسەر پۆلیسەکاناو هەرچی بەدەمما هات پێم کردن. یەکێکیان نوکە شەقێکی تێ هەڵدام‌و ووتی‌ی :

-وزبە سبەی شەویش نۆرەی تۆیە، خەتای خۆتانە قسە بکەن بابەم مەرەیە ئەچن ئەوی ڕاستی بێ لەتاو تۆ گریانیشم لەبیر ئەمابوو بەڵام کەدەستم لەمەچەکت دا تۆزێ ئەبزت ئەبزوت بەمە ئەختێ سەبووری بەدڵما هات. ئیتر بەدیارتەوە دانیشتم هەر فرمێسکم هەڵ ئەڕشت تا ئێستا چاوم لێت بوو چاووت ئەتروکاندو گوێم لە ئۆفەکەت بوو بەمە دڵم کرایەوە .

-هیچ باکم نی‌یە چیم لێ ئەکەن بالیم بکەن بەڵام وابزانم ئیم شەو بێتەوە نۆرەی تۆیە. من ئەزانم بەرگەی ئەم ئازارە ناگری‌و ئەت کوژن. سەرەڕای ئەمەش هەرچەند بیر ئەکەمەوە تۆ بەتەنها ڕووتت بکەنەوە لەبەر دەستی ئەو دڕندانەدا.. بەڕاستی ئەمەیە ئازاری ڕاستەقینەم.

گەلاوێژ دەستێکی هێنا بەقژە ڕەشەکەی رەئیس بەکرداو پێ‌ی ووت:

-من یەکەم ئافرەت نیم کە کەوتبمە ژێر دەستی ئەو چڵکاو خۆرانە هەرچی چۆنێ بێ دڵنیابە کە دڵی دوژمن خۆش ناکەم رەئیس بەکر لەو کاتەدا قسەکەی بەگەلاوێژ بڕی‌و ووتی :

-ئەوە چیە؟ ئەو دەنگە دەنگ‌و قیژە قیژە چیە؟!

-ئا! تەقەی تفەنگ یە!

-گەلاوێژ هەستایە سەرپێ‌و خۆی بەپەنجەرەکەدا هەڵواسی و کەسەیری حەوشەکەی کرد قیژاندی‌و خۆی فرێ دایە خواری‌و ووتی:

-بەکر .. بەکر هەرایە.. ئای ئەو هەموو خەڵکەچیە لەو حەوشەیەدا.. خوێن ڕژاوە.. لاشە کەوتووە.. گەلاوێژ ئەم قسانەی ئەکرد کە دەرگای ژوورەکەیان داگیرا بەشەق‌و مستەکوڵەو دار. ئەوەندەی پێ ئەچوو دەرگا شکاو خەڵك هورووژمی هێنایە ژوورەوەو گەلاوێژ هەستایە سەر پێ‌و قیژاندی:

-ئەی ئەوە ئزارە .. ئەوە ئزارە بەکر.. ئزار گیان ئزار پەلاماری خوشکی دار دەستیان کردە ملی یەکتری لەپاشا کە ڕزگارتان بوو.. گەل هەمووی ڕزگاری بوو.. سەیر کەن جانەوەرەکان چی‌یان لەرەئیس بەکر کردووە لەپاشا ڕووی کردە خوشکی‌و ووتی :

-دیارە هێشتا ئۆرەی تۆ ئەهاتبوو؟

-وابزانم ئیم شەو ئۆرەی ئازاردانی من بوو. بەڕاستی ئزار، بەکر قارەمانانە لەبەر دەمیانا ڕاوەستا.

ئزار سەری شۆڕکردەوە بەسەر رەئیس بەکردا ناوچەوانی ماچ کرد. رەئیس بەکر لێ‌ی پرسی:

-ئا کاك ئزار بۆ مانی بگێرەوە چۆن ئەم شۆڕشە هەڵگیرساو سەرکردەکەی کێ‌یە ؟

-ئیستا کاتی گێڕانەوەی ئەمە نی‌یە.. پەلەمانە ئیشی ترمان بەدەستەوەیە. بەڵام لەبەر ئەوەی زۆر بەپەرۆشی‌ی بەکورتی بۆتی ئەگێڕمەوە: ئەم بەیانی‌یە لەشیرین خەوا باوکم خەبەری کردمەوەو ووتی هەستە گوێ بگرە ئەمە چی‌یە؟ تومەز باوکم هەستابوو بۆ نوێژی بەیانی وەلەسەر خوی جارانی رادیۆکەی کردبوەوە گوێ لە قورئان بگری. کە هەستام گوێم لێ بوو بێژەرەکە ئەی‌ووت (ئێرە رادیۆی جمهوریەتی عێراقە.. ئێرە رادیۆی جمهوریەتی عێراقە) لە پاشا بێژەکە ووتی:

(لەفەرمانەی هێزی سپایی‌یەوە بۆ گەل عێراقی ئەبەز منیش ئیتر خۆم پێ ئەگیرا بەپەلە پروسکێ جلەکانم لەبەر کرد، هەرچەندە باوکم ویستی ئەچمە دەرێ بەڵام گوێم ئەدایە کە گەیشتمە شەقامەکە ئەبینم چی! تف هەڵداوی لەبەر خەڵکی ناکەوێتە زەوی، دەنگی هۆسەو گۆرانی ئەگاتە کەشکەلانی فەلەك بەهەزارەها مستە کوڵەی پۆلاینی گەل بەرز ئەبێتەوەو ئزم ئەبێتەوەو بەژیانی جمهوریەت‌و سەرکردەکەی هاوار ئەکەن. ئیتر شەپۆلی خەڵکی لەشەقامەکاندا ئەی ئەکێشا ئەت ووت ڕۆژی حەشرە. کە گەیشتمە شەقامی رەشید کابرایەك پەت کرابوو رایان ئەکێشا کەسەرنجم دایە ناسیمەوە لاشەی عەبدول ئیلاه بوو لەگەڵ خەڵکەکەدا بەرەو ژوور بوومەوە لەپڕ یەکێك بانگی کرد بەرەو تەحقیقاتی جنائی بەرەو تەحقیقات کە گوێم لەم ووشەیە بوو ئیوەم بیر کەتەوەو لەگەڵیان هاتم.

رەئیس بەکر لێ‌ی پرسی:

-ئەی سەرکردەی شۆڕشەکە کێ‌یە؟



-پێشەوا عەبدول کەریم. ئێستا لەهەموو گۆشەیەکی عێراقدا ناوی بەسەر هەموو دەمێکەوەیە.

کەرەنیس بەکر گوێی لەم ناوە بوو ئازاری لەشی لەبیر چووەوە، خەریک بوو تەکان بداتە خۆی هەستێ. بەڵام گورج نزار دەستی خستە سنگی و پێی ووت:

-نەبزووی. نەبزووی. ئەگینا برینەکانت بەناسۆر ئەکەوێ. ئەم ناوەکار لەهەموو کەسێ ئەکا

-من دەساڵ لەژێر فەرماندەی یا خەبات ئەکەم. دەساڵە بەم ئاواتەوەین بەڕاستی پێشەوایەتی و سەرکردایەتی هەر لەخۆی دێ. مانگێك نابێ کەمژدەی هەڵاتنی ئەم ڕۆژەی ئەداینێ

نزار ووتی:

-ئەوە سەیرە تا ئەم بەیانییە کەس ناوی نەئەزانی.

ئیتر درەنگە هەستێ بابڕۆین

گەلاوێژ ووتی:

-بەکر ناتوانی بڕوا بەڕێوە ئەبێ ئۆتۆمبیلێك بێبا بۆ نەخۆشخانە برینەکانی ببەژێننەوە، نزار دەریەڕی و پاش تۆزێك گەڕایەوەو وتی:

ئۆتۆمبیلی‌نەخۆشخانە لەبەردەرگا ڕاوەستاوە گەلاوێژو نزار هەریەکەیان چوونە بن قولێکی بەکرو لەپێش خەڵکەکەوە ڕۆیشتن کە گەیشتنە بەر دەرگا گەلاوێژ قیژاندی و دەستی گرت بەچاویەوە نزار پێی ووت :

-چییە؟ بەزەییت بەم سێ دڕندەیەدا یەتەوە کە هەڵواسراون؟. ئەمانە یەکێکیان نائیلە، ئەوی تریان خەزعەلە کە بەکرو هەزاران ئازادی خوازی تریان بەسەرەی بەکر بردووە وەدەستیان بۆ ناموسی نافرەتە تێکۆشەرەکان ڕاکێشاوە ..

رەئیس بەکر هەڵی دایە

-دوا ڕۆژی ستەم کارو زۆردار هەر ئەمەیە.

لەپاشا نزار پێی ووتن:

-جاری ئێشم زۆرە ناتوانم لەگەڵتان بێم بۆ نەخۆشخانە .

خواتان لەگەڵ.

-١٢-

ئۆتۆمبیلەکە لەبەر خەڵکی زۆر وورد ئەڕۆی، تاو تاویش بۆی ئەوەستا. لەهەموو لایەکەوە کۆ بوونەوەو چەپڵە ڕێزان و خوتبە خوێندنەوەبوو. رەئیس بەکر لەناو ئەم دیمەنە خۆشە گوێی ئەئەدایە ئازاری لەشی بەدانیشتنەوە لەپەنجەرەی ئۆتۆمبیلەکەوە سەیری ئەکردن لەپڕ ووتی:

-ئەو دووکەڵە چییە لە دوور بەرز ئەبێتەوە؟

شۆفێرەکە وەڵامی دایەوە

-ئەوە کۆشکی (رەحاب)ە خەڵکی ئەیسوتێنێ ئەو کۆشکەیە کە تا دوێنێ کەس نەی ئەوێرا بەلایا بچێ

-ئەی ئەمانە چین هەر یەکە گوڵێکی بەشانەوەیەو بەرگی گوینییەیان لەبەردایە، ئەڵێی لەبەندیخانە هاتونەتە دەرێ.

-بەڵێ، ئەمانە ئیشتمان پەروەرە بەند کراوەکانن دەرگی بەندیخانەیان بۆ خراوەتە سەر پشت بەرەو ماڵ ئەبنەوە

لەم کاتەدا ئۆتۆمبیلەکە لە وەزارەتی بەرگری نزیك بوەوە خەڵکێکی ئێجگار بێشوومار لەوناوەدا کۆبوبوونەوە. ئیتر ڕێگا نەما ئۆتۆمبیلەکە بڕوا لەجێی خۆی ڕاوەستا لەم ئانەدا رەئیس بەکر هاواری کرد:

-بژی پێشەوا.. ئەوە پێشەوای خۆشەویستمانە، ئەوە زەعیم عەبدول کەریمە لەسەر بانی وەزارەتی بەرگری سڵاو لە خەڵکەکە ئەکا..

سەیرکە گەلاوێژ ..نای ئەوە هەموو برادەرەکانمە لە ئەفسەرە ئازادی خوازەکان لەتەنیشتیەوە ڕاوەستاون. ئەوە ..

گەلاوێژ ئەیهێشت رەئیس بەکر یەکە یەکە ناوی هەڤاڵەکانی خۆی ببرێ کە هاواری کرد:

-بەکر .. بەکر.. ئەوە فەرهادی براشمە لەتەنیشت پێشەواوە ڕاوەستاوە .. نای بەساقەت بم فەرهاد گیان..

گەلاوێژ لەخۆشیا دەستی رەئیس بەکری ئەگوشی و فرمێسك بە چاویا ئەهاتە خوارێ. رەئیس بەکر لەپڕ دەستی کردە ملی گەلاوێژو ووتی:

-با دابەزین

-چۆن دائەبەزی. ناتوانی بڕۆی. برینەکانت ئەکولێنەوە.

-برینەکانم هەمووی سارێژ بوو. هیچ ئازارم نەماوە. ئەبێ تێکەڵ بەم گەلە بین

ناچار گەلاوێژ قولی گرت و لە ئۆتۆمبیلەکە دابەزین.

شۆفێرەکە بە زەردەخەنەیەکەوە سەیری ئەکردن تا لەناو خەڵکەکەدا لەچاو وون بوون. ئینجا لەبەر خۆیەوە ووتی:

ع موعجیزەیەکە سەریەستی.. کوێرا ئەم لەش هەنجن کراوەی چاك کردەوە.

١٩٥٩

بیرەوەری:

## لەگەڵ شەهیدی نەمر حەمە قودسیدا

لەساڵی ١٩٣٦دا کە گەڕامەوە بۆ سلێمانی، هێشتا بۆنی بارووتی شەست تیرەکانی حکومەتی شایەتی خوێن ڕێژ نەبڕابوەوە، ئەو شەست تیرانەی لە شەشی ئەیلوولی ساڵی ١٩٣٣دا لەبەر دەرکی سەرا ئاراستەی سنگی لاوانی کورد کرا کە هەموو خەتایەکیان ئەوەبوو داوای مافە خوراوەکانی نەتەوەکەیان ئەکرد وە ئەیان ویست عێراق نەبەسترێ بەهیچ پەیمانێکی ئیمپریالیزمییەوە، وە هەروەها هێشتا تارمایی خیانەت لەشارەکەماندا نەڕەوی‌بوەوە، خیانەتی ئەو کاسەلێسانەی بەسەر لاشەی شەهیدەکانی شۆڕشی شەشی ئەیلولدا گەیشتنە ئەو پایەیەی بتوانن پاشماوەی خوانی دەستەو دایەرەی فەیصەڵ خانن بەهەموو سەر شۆڕییەك هەڵ قوڕێنن. سەرەڕای ئەم کارەساتە هێزی کۆنەپەرستی بەیارمەتی ئیمپریالیزمی بەریتانیا چەمکی بێ ئابڕوویی لێ کردبو بەلادا بۆ چاندنی تۆوی بێ هیوایی و دوودڵی و دووبەرەکی و بێ‌ڕەوشتی لەدڵی ئیشتمان پەروەرەکاندا بەهیوای ئەوەی بڵێسەی ئاگری نەتەوایەتی بکا بەخۆڵەمێشی سارەوە بوو ئەو هۆشی نەتەوایەتی‌یەی تۆپ‌ۆ بومبا هاوێژەکانی ئیمپراتۆریەتی بەریتانیا نەك هەر نەیتوانی لەناوی بەرێ؛ بگرە زیاتر هێزی پێ پەیدا کردو بەرزی کردەوە تاوای لێ هات بەرژەوەندی ئیمپریالیزمەکانی خستە مەترسییەوە لەهەموو عێراقدا.

لەم کاتە پڕ گێژو گرفتەدا کە دۆست و دوژمن بەگران لەیەك جیا ئەکرایەوەو گەلێ لە ئیشتمان پەروەرەکان لەکونجی گۆشە گیریدا تەپوتۆزی بێ هیوایی‌یان لێ نیشتبوو، وەبەد بینی‌یەکی رەش باوەشی کردبو بەشارەکەماندا، ئا لەم کاتەدا کە قوتابی بووم لەپۆل یەکەمی قوتابخانەی ناوەندی لەریزی پێشەوەی ژووری دەرس ووتنەوەکەدا لاوێکی باڵا بەرزی لاوازی ڕوومەت کونی خورماوی دانەنیشت، زۆر کەرەت لەگەڵ مامۆستای مێژوودا زۆر بەنازایەتی ئەکەوتە پیلەبازی لەسەر مێژووی نەتەوەی کورد، وە کە لەدەرس ئەبووینەوەو لەگوێ

سوپەکە مۆڵمان نەخوارد هەر هەوڵی ئەوەی بوو باس بێنێتە سەر باسی باری نەتەوەی کورد وەزۆر بەتوندی ڕەخنەی لەبرادەرکانی ئەگرت لەسەر کەم تەرخەمی و بێ بڕوایی‌یان.

ئەم لاوە بەپەرۆشە بۆ نیشتمان و گەلەکەی حەمە قودسی بوو کە ڕۆژ بەڕۆژ ئەچو بەدڵما ئەم ویست پەیوەندی لەگەڵدا بەهێز بکەم چونکە هەستم ئەکرد کە بیرو باوەڕی هەردوکمان زۆر لەگەڵ یەکدا ئەگونجێ، لەبەر ئەوە لەکاتی وچانەکاندا لە حەوشەی قوتابخانەکە پێکەوە بەدەم هاتو چۆکردنەوە ڕازی دلی خۆمان بۆ یەک هەڵ ئەڕشت و داخمان ئەخوارد بۆ ئەم پەرش و بلاویەکی کەوتبوە ناو نیشتمان پەروەرەکانەوە وە بیرمان ئەکردەوە ڕێگایەک بدۆزینەوە بۆ یەک گرتنەوەی بزووتنەوەی نیشتمانی و قەلاچۆ کردنی دوودڵی و ناکۆکی. وە کە دەوامی قوتابخانەش ئەبڕایەوە دەستمان ئەگرتە بەر لەژێر درەختێکا دائەنیشتین ڕێگامان دائەنا بۆ دامەزراندنی کۆمەڵێکی سیاسی نهێنی نیشتمانی بۆ بەهێز کردن و پتەو کردنی بزووتنەوەی نیشتمان.

ئیتر پەیوەندی هاوڕێیەتیم لەگەڵ قودسیدا وا بەهێز بوو ئەمان ئەتوانی لەیەک جیا ببینەوە، زۆربەی شەو لەماڵی ئەوان یا لەماڵی ئێمە پێکەوە دائەنیشتین تا نیوە شەو بەخوێندنەوەی ئەدەب و مێژووی نەتەوەکەمانەوە رامان ئەبوارد وە ئەهاتینە سەر باسی باری نەتەوە داگیر کراوە دابەش کراوەکەمان وە ئەو ڕێگایەی پێویستە بگیرێ بۆ رزگار بوونی لەم قۆرتە پڕ تەنگ و چەڵەمەیە، قودسی ئەمر فرمێسک لە هەردوو چاوێدا قەتیس ئەوەستا هەردوو دەستی ئەگلۆفت وە بەدەنگێکی پڕ لە جۆش کە ئێستاش لە گوێمدا دەنگ ئەداتەوە ئەیوت ((هەر ئەبێ بەو ڕۆژە پیرۆزە بگەین نەتەوەی کورد لەم خەوە ڕاپەڕێ و سەری داگیرکەرانی کوردستان پان بکاتەوە، گومانی تیا نی‌یە ئەو ڕۆژە هەر یەت ئالای سەربەستی و سەربەخۆیی گەل کورد بەسەر شاخەکانەوە بشەکێتەوە هەر ئەوەندە گیانی خۆدانان و لەخۆ بووردنمان ببێ))

بەم گیانە پاکەوە بەم هەستە بەرزەوە بەم هیوا بەهێزەوە بەدوا ڕۆژی گەل وە بەم دەرک کردنە قووڵە بەچۆنیەتی جێ بەجێ کردنی کێشەی پڕگیرو گرفتمان، شەهیدی ئەمر حەمە قودسی تێ ئەکۆشا بۆ رزگار کردنی گەلە چەوسارەکەی.

رۆژێ لە ڕۆژانی ساڵی ١٩٣٧ بەیانی بوو هێشتا دەرس دەستی پێ نەکردبوو، ئێمەش لەحەوشەکەدا هەر دوان و سیان پێکەوە ئەهاتین و ئەچوین، هەر تاقە لەباسێک ئەدوا، ئەوەندەم زانی حەمە قودسی بەپرتاو پەشوکاوی و چاو بەفرمێسک بەرەو پیرم هات و بەهەناسە سواری‌یەوە ووتی:

ئەوە چی ئەکەن، ئەڵێی ئاگاتان لەدنیا نی‌یە، ئێستا لەبەغداوە بروسکە هاتوە ئیمرۆ بەرە بەیان نیشتمان پەروەری دڵسۆز محمود جەودەت لە سێداره دراوە وە تەرمەکەی بەرێکاوەیە.

بەگریانەوە ئەم قسانەی کرد، ئەمە دەروونی هەموو قوتابیانی هێنایە جۆش و شەپۆل قین و بێزاری بەرامبەر ئەم تاوانە گەورەیە لە قوتابخانەکەدا بەرزبوەوە، وە کە زەنگی دەرس دەست پێکردنی لێدا قوتابی‌یەکان لەباتی ئەوەی بەرەو پۆلەکانی خۆیان بڕۆن لەحەوشەدا کۆبوونەوە وە قودسی ئەمر بەخوتبە ئاگرینەکەی هەموانی هێنایە گریان و بەرەو دەرەوە بۆ چوون بەپیر تەرمەکەوە قوتابیەکان هێرشیان هێنا بەبێ ئەوەی هەڕەشە و گوڕەشەی بەڕێوەبەری قوتابخانەمە کاریان لێ بکا.

دوای ئەم تاوانە گەورەیە، ئەو بیرەی کەلەسەری بوین و بلاومان ئەکردەوە بۆ پێک هێنانی کۆمەڵێکی سیاسی نیشتمانی کەلالە بوو، لەماڵی حەمە قودسی بیست کەسێک ئەبوین کۆبووینەوە وە لەم کۆبوونەوەیەدا کۆمەڵی (یەکێتی) لێ پێک هات کەیەکێ لەئیشەکانی پێشکەش کردنی پرتستۆیەک بووبە هەموو باڵیۆزەکانی دەوڵەتەکان لەبەغدا دژی کردەوەی جانەوەرانەی حکومەتی فاشیستی تورکیا بەرامبەر برا کوردەکانمان وەلەبەر ئەوەی ئەوسا هیچ هۆیەکی چاپ کردنمان بەدەستەوە نەبوو حەمە قودسی کە لەهەمووومان خەت خۆش تربوو نووسیەوەو ڕەوانەمان کرد بەیەکێکی باوەڕ پێ کراودا (لام وابوو مەجول ووتوچی‌بوو)وە لەسەر ئەمە دایەرەی پۆلیس تەنگی بە مامۆستا ئیسماعیل شاوەیس هەڵچنی و گەلێ هاتووچۆی پێ کرد هەرچەندیشە ئاگای لەمە نەبوو.

پاش ماوەیەک لەبەر هەندێ هۆ کە لێرەدا جێگای باس نی‌یە ناکۆکی کەوتە نێوان ئەندامانی ئەم کۆمەڵەوە وەبلاوەی لێ کرد

لەساڵی ١٩٣٨لەسەر پێشنیازی حەمەقودسی هەردووکمان پەیوەندیمان پەیدا کرد لەگەڵ کۆمەڵی (خەوەی بیون) لەسووری‌یە بەهۆی عوسمان صەبریەوە کە یەکێک بوو لەنیشتمان پەروەرەکانی کوردستانی تورکیاو پەنای بردبووە بەر سووری‌یە، بەم جۆرە ئاڵ و گۆڕی نامە دەستی پێ‌کرد لەنێوان ئێمەو ئەو کۆمەڵەدا، تا جارێکیان بەپۆستەدا (٤٠) ئالای کوردستانیان بۆ ناردین کە بەشێوەیەکی زۆر نایاب و ڕەنگاو ڕەنگ چاپ کرابو بۆ هەڵواسین بەبیرۆکدا ئێمەش پێشکەشمان کرد بەو برادەرانەی باوەڕیان پێ ئەکەین، وە لایەن خۆشمانەوە هەرچی هەواڵ و باسی کوردستانی عێراق هەیە بۆ مان ئەناردن

لەم کاتەدا کە ئێمە خەریکی ئەمە بووین، بیستبوومان کە شێخ لەتیف و چەند کەسێکی تر کۆمەڵێکی سیاسیان پێکەوەناوە بەناوی (برایەتی)یەوە، بەلام ئەمان ئەزانی ڕژێم و پرۆگرامی چیە لەبەر ئەوە هەوڵمان ئەدا تێی بگەین بۆ ئەوەی هەڵوێستی خۆمان بەرامبەری دیار کەین وەئەگەر بەباشمان زانی بچینە ناریەوە، وە وادیار بوو کاربەدەستانی ئەو کۆمەڵەش ڕاوی ئێمەیان ئەکردو ئەیان ویست ڕامان کێشن بۆ لای خۆیان، ڕۆژێک حەمە قودسی لەگەڵ محمد خضر (ئێستا لە دائیرەی تەسوی‌یەیە) هاتن بەشوێنما بچین بۆ گەڕان چونکە لەکۆمەڵی یەکێتیەوە ناسیاویم لەگەڵ محمد خضر پەیدا کردبوو وە چوویوو بەدڵما، کەلەشار دوورکەوتینەوە محمد خضر باسی کردەوەو داوای لەهەردووکمان کرد بچینە ناوکۆمەڵی برایەتی‌یەوە وە تێی گەیاندین کە ئامانجەکەی سەربەخۆیی و سەربەستی کوردستانە وەئەندامەکانیشی لەدڵسۆزترین نیشتمان پەروەرەکان پێک هاتووە، لەگەڵ قودسی‌دا پاش گفتوگۆیەکی دوورودرێژی بڕیارمان دا بچینە ناو ئەوکۆمەڵەوە بۆ ئەوەی بەباشی لەئامانج و نیازی بگەین خۆ ئەگەر بەباشیشمان نەزانی تێکەیشتین ئەیانەوێ لەژێر پەردەی ئامانجێکی پیرۆزدا بگەنە ئامانجێکی خۆیی و تەسک وانەک هەر لێی بێینە دەرەو بەس، بەڵکو ئیازە ئالەبارەکەشیان ئەخەینە ڕوو بۆ خەڵکی

تا نەتوانن کەس تەفرە بدەن، کە لەهەردوو بارەکەدا سوود ئەگەیەنین بەگەلەکەمان لەسەر ئەم بڕیارە هەردوکمان بووین بەئەندام لەو کۆمەڵەدا. بەڵام پاش ماوەیەك تێگەیشتین کە لەهەزار بابەتە پیاوی تیا کۆبۆتەوە کە هیچ شتێ بەیەکیانەوە نابەستێ لەبەرژەوەندی خۆیی بەولاوە ئەمە جگە لەوەی نەپرۆگرامێکی ئاشکرای ڕوونی هەبوو وە نەڕێك و پێکی

نەبوو هەرکەسێ ببێ بەئەندام لەماڵی شێخ لەتیفی دانساز یا خانەقای مەحوی دەست نوێژی بشتایەو سوێندی بخواردایە بەس بوو لەهەمووشی سەیر تر ئەوەبوو کە بەشی زۆری پۆلیس بوو. لەبەر ئەوە من و قودسی و چەند نیشتمان پەروەرێکی تر لێی تەکینەوە، وەکومەڵەکەش ئەوەندەی پێ نەچوو بڵاوەی لێ کرد.

لەکۆتایی ساڵی ١٩٣٩دا لەگەڵ قودسیدا لەیەك جیابووینەوە بۆ ئەوەی لە بەغدا لەخوێندنگای سپاییدا بخوێنێ کە زۆر ئارەزووی سەربازێتی ئەکرد وە لە مەشقی (فتوە)دا کە ئەوسا پێمان ئەکرا لەهەموومان چالاکتربوو وەکرا بەسەر کردەی هێزی (فتوە)، وە لەهەموو بۆنەیەکدا ئەم ووشەیەی دووپات ئەکردەوە ((پێویستە لەسەر هەموو لاوێکی کورد فێری ژیانی دژواری بێ و ئامادە بێ بۆ ڕۆژی هەلمەت)).

ڕۆژێك لەبەغداوە نووسراوێکم لەقودسی یەوە بۆ هات تیایا ئەوەی گەیاندم کە بووە بەئەندام لە کۆمەڵی (هیوا)دا وە داوای لەمنیش کرد لەوکۆمەڵەدا بەشدار بم. من هەر چەندە لەوەوپێش ئەم زانی ئەم کۆمەڵە پێك هاتوە وە هەندێ لە ئەندامانی داوایان لێ کردم بچمە ناویەوە، بەڵام لەسەر کۆمەڵی برایەتی دا بەڵێنم دابوو بەبێ لێکۆڵینەوەیەکی قووڵ نەچمە هیچ کۆمەڵێکەوە، وە کە ئەم نامەیەی قودسیم پێگەیشت وە لەبەر ئەوەی بڕوایەکی تەواوم پێی هەبوو لەبەڵێنەکەی خۆم هاتمە خوارێ وەبەهۆی یەکێ لەئەندامانی ئەو کۆمەڵەوە کەلەوەو پێش لەگەڵم خەریك بوو خواستم پێش کەش کرد وەبووم بەئەندام لەکۆمەڵی ناو براودا.

ئامانجی کۆمەڵەی هیوا ڕزگارکردنی کوردستان بوو وەگەڵێ لەڕۆشن بیرو ئەفسەرە کوردەکانی تیا بوو وە لەکۆمەڵەی برایەتی ڕێك و پێك تربوو؛ بەڵام ئەمیش لەسەر بنەڕەتێکی جەماهیری دانەمەزرابوو وپرۆگرامێکی زانستی نەبوو لەسەری بڕوا هەر تەنها هەستێکی ڕووتی کوردایەتی نەبێ. لە کۆمەڵەدا قدسی ئەمر دەورێکی باڵاو چالاکیەکی بەرزی بەجێ ئەهێنا چ لەڕێك خستنی ئەفسەرەکانو بەرزکردنەوەی هۆشیان وە (چ) لە زیانی حالی کۆمەڵەکەدا (گۆڤاری هیوا) کەبەدەست ئەنووسرایەوە.

وەکە بڵێسەی شۆڕشی ڕزگاری گەل کورد لەبارزان بەرز بوەوە بەسەرکردایەتی تێکۆشەری مەزن مستەفا بارزانی، وەکۆمەڵی هیوا داوای لەئەفسەرە کوردەکان کرد لەشۆڕشەکەدا بەشدار بن، قودسی ئەمر لەپێش مەرگەکانی شۆڕشەکەبوو، وەئەندامانی لیژنەی ئازادی بوو کەئیشی دەستەی ئەرکانی جەنگی ئەبردبەڕێوە، وەلەو خەباتە خوێناویەدا ئازایەتی و دڵسۆزی قودسی جێگای شانازی هەموو کوردێك بوو.

وەك ئاڵای جمهوریەتی کوردستان لە مەهاباد بەپێشەوایەتی قازی محمدی ئەمر هەڵکرا وەشۆڕش گێرە قارەمانەکانی بارزان کشانەوە بۆ جمهوریەتی کوردستانی ئازاد قودسی ئەمر لەگەڵ ئەفسەرەکانی تری هەڵآیا لەپێناوی پاراستنی ئەو جمهوریەتە کۆرپەیدا کەلەهەموو لایەکەوە کۆنەپەرستی و ئیمپریالیزمەکان وەکو سەگی هار دەمیان بۆ داچەقاندبوو خۆیان بەخت ئەکردو شەوتخونیان ئەکێشاو لەڕیزی پێشەوەی هێزی بەرگری جمهوریەتی کوردستاندا بەرگری سەربەخۆیی و سەربەستی ئەو بەشە کوردستانەیان ئەکرد کە تازە تیشکی ئازادی لێ هەڵهاتبوو.

لەو کاتەدا لەکوردستانی عێراق بەهۆی ئەو کارەساتانەی لەکوردستان و دەرەوەی کوردستاندا ڕووی ئەدا، بەتایبەتی شۆڕشی بارزان و دامەزراندنی جمهوریەتی کوردستان لە مەهاباد بزوتنەوەی نیشتمانی ئێجگار بەرز بوەوەو پەرەی سەند، وە هۆشی نەتەوایەتی باشتر پێگەیشت و لەقاڵبە تەسکەکەی جارانی هاتە دەرێ، ئەم بارە نوێیە پێویستی ئەکرد بەپەیدا بوونی پارتی یەکی دیموکراتی نیشتمانی لەکوردستانی عێراق دا لەسەر ڕۆشنایی پرۆگرامێکی زانستی بڕوا بەڕێوە کەدەست بدا بۆ ئەو قۆناغەی تەتەوەی کورد پیا ئەڕوا تا بتوانێ بزوتنەوەی نیشتمانی لەهەموو عێراقدا بەهێز بکا بەپتەو کردنی برایەتی کوردو عەرەب و کەمە نەتەوایەتیەکان، وەکۆ کردنەوەی جەماهیری کورد لەژێر ئاڵای یەك پارتی شۆڕشگێڕدا وەپاڵ پێوە نانی بۆ کۆڕی خەبات لەپێناوی ڕزگار کردنی عێراق و کوردستانی عێراقدا. بۆ ئەم ئامانجە گفتوگۆ دەستی پێ کرد لەنێوانی کوڕە دیموکراتیەکانی عێراقداو شۆڕشگێڕەکانی بارزان لەژێر ئامۆژگاری تێکۆشەر مستەفا بارزانیدا وەبۆ ئەم مەبەستە نوێنەرێك لەمەهابادەوە هات بۆ کوردستانی عێراق و کەوتە گفتو گۆ لەگەڵ نوێنەرانی ئەو پارتی و کۆمەڵانەی هەبوو کە ئەوسا بریتی بوون لەمانە: ١-پارتی ڕزگاری ٢-لقی کۆمەڵەی (ژ.ك). ٣-پارتی شۆڕش کە دەستەیەك بوون لەپارتی کۆمۆنیستی عێراق جیابووبوونەوە، ٤-لقی کۆمۆنیستی عێراق پاش گفتو گۆیەکی زۆر پارتی کۆمۆنیستی عێراق ڕێك نەکەوت لقی خۆی هەڵبوەشێنێ لەکوردستاندا تێکەڵ بەم پارتی یە ببێ، لقی (ژ.ك) هەڵوێستێکی ڕاڕایان هەبوو، بەڵام پارتی ڕزگاری و شۆڕش ڕێك کەوتن لەسەر پێك هێنانی ئەم پارتی یە نوێیە. لەهاوینی ساڵی ١٩٤٦دا لەبەغداد کۆنگرەیەك گیرا لەم کۆنگرەیەدانوێنەرانی پارتی شۆڕش ئامادەنەبوون چونکە لەبەڵێنەکەی خۆیان پەشیمان ببوونەوە وە بڕیاریان دابوو تێکەڵ بەپارتی کۆمۆنیستی عێراق ببنەوە. بەڵام نوێنەری لقی (ژ.ك) لەهەڵوێستی پێشووی خۆی هاتە خوارێ. بەم جۆرە لەو کۆنگرە مێژوویی یەدا پارتی دیموکراتی کوردستان بەسەرکرادیەتی یەکەم تێکۆشەری کوردستان مستەفا بارزانی لەدایك بوو.

وە قودسی ئەمرو هاوڕێ ئەفسەرەکانی تری بوون بەئەندامی ئەم پارتی یە شۆڕشگێڕە پێشڕەوە پاش لەناو چوونی جمهوریەتی کوردستان لە مەهاباد بەهۆی هێرشە ئامەردانەکەی هێزی شای ئێرانەوە بەیارمەتی ئیمپریالیزمی ئینگلیزو ئەمریکی، قودسی و چەند ئەفسەرێکی تر لەسەر سنووری عێراق پاش ئەوەی کاربەدەستانی خائن بەڵێنیان دانێ ژیانیان بپارێزن خۆیان دابەدەست سوپای عێراقەوە، بەڵام کەی خائینی چەپەڵ بەڵێن و پەیمانی هەیە!.

ئەم ئەفسەرە نیشتمان پەروەرە قارەمانانە ڕەوانەی بەغداد کران، وە لەزیندانەکانی بەندیخانەی ئاوەندیدا کۆت و زنجیر کران

لەبەرە بەیانی ڕۆژی ١٩ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٤٧دا لەو بەندیخانەیەدا لاشەی چوار لاو ئەلەری یەوە بەسێدارەوە لاشەی محەمەد قودسی، عزت عزیز، مستەفا خۆشناو، خیرالله عبدالرکیم. ئەو چوار قارەمانەی هەروەکو لەکۆڕی خەباتدا پریشکی ئاگری دوژمن تا ئەهات باشتر سووری ئەکردنەوە قاڵ تری ئەکردن، زرەی زنجیرو زیندانی تاریك و سی دارەی سامناك نەیتوانی دڵی پۆلایینیان بلەرزێنێ و زەردەخەنەی پڕ لەهیوا بەنزیك بوونەوەی ڕۆژی ڕزگاری گەلەکەیان لەلێویان بکاتەوە.

بەم جۆرە تێکەڵ بەقافڵەی شەهیدانی گەل کورد بوون و دەرگای ئەمریان بۆ خرایە سەر پشت.

وتار

# ڕادەی سەربەستی پێوانەی سەربەخۆیی گەلە

زۆر دەمێکە زانراوە دیموکراتیەت واتەی فەرمان ڕەوایی گەلە. گەل خۆی کاروباری خۆی ئەبا بەرێگاوە بەهۆی ئەو نوێنەرانەی خۆی بەهەموو سەربەستی یەکەوە هەڵیان ئەبژێرێ. جا گەلە ڕژێمێکی دیموکراتیدا هەر گەل خاوەن دەسەڵات بێ، ئەمە ئەوە ئەگەیەنێ کە گەل هەموو کۆششێکی و ڕەنجێکی بۆ بەرژەوەندی خۆی تەرخان بکات و هەموو وزەو توانایەکی خۆی بەکار ئەهێنێ بۆ پێش خستن و پەرەپێدانی سامانە نیشتمانی یەکەی لەسەر بناغەیەکی زانستی و عەدل و حەقیانەت دابەش بکرێ کەهەریەکە بەپێی ڕەنجی خۆی لەم سامانەدا هاوبەش بێ کەبەمە ڕۆژ بەڕۆژ ژیانی ئابوری و کۆمەڵایەتی و تەندروستی و ئەقافی ڕولەکانی گەل گەشە ئەکاو بەرزتر ئەبێتەوە. ئەم ووزە دروست کەریە گەورەیەش گەلە هەموو نەتەوەیەکدا هەیە بەرەڵلا نابێ بەبێ سەربەستی یەکی ڕاستەقینەی تەواو لەبەر ئەوە ئەبینین لەو وڵاتانەی فەرمان ڕەوایی ئەکەوێتە ژێر دەستی گەل لە پێش هەموو شتێکدا سەربەستی یە دیموکراتیەکان بەرەڵلا ئەکرێن لە شێوەیەکی ناراستە کراودا، وەکو سەربەستی بیرو باوەڕ، سەربەستی پارتێتی، سەربەستی دامەزراندنی ڕێک خراوەکان، سەربەستی پێک هێنانی نەقابەکان، سەربەستی ڕۆژنامەگەری سەربەستی کۆبوونەوە، سەربەستی مانگرتن و خۆپیشان دان، وە تاد.

وە هەروەکو بەتاقی کردنەوە دەرکەوتوە ژیانی گەل لەهەموو ڕوویەکی وە پێش ناکەوێ و ناخەملێ بەبێ دیموکراتیەکی ڕاستەقینەی ناڕاستەکراو، وە ئەم دیموکراتی یەش ناپارێزرێ و پێش ناکەوێ بەبێ شوورایەکی پتەوی بەهێز کە سەربەخۆیی یە، کەوابێ سەربەخۆیی ئامانجێک نی یە خۆ بەخۆی خۆی بێ، بەڵکو هۆیەکە بۆ بەرگری کردن لە مافەکانی گەل، بۆ پاراستنی دەست کەوتەکانی و سەربەستی یە دیموکراتیەکانی.

وە ئەگەر هات و هەر نەتەوەیەک لە چوار چێوەی سەربەخۆییدا بێبەش کرا لە سەربەستی یە دیموکراتیەکانی بەهۆی ڕژێمی دکتاتۆری ڕوودا پۆشراو یا ڕووبەڕەڵلا وە سامانە ئابووری یە نیشتمانی یەکەی تەنها چەند کەسێک خێریان لێ بینی و خواردیان، ئەویش لە هەژاری و نەزانین و نەخۆشی و چەوساندنەوەدا تلایەوە، ئەوسا سەربەستی نیشتمانی هیچ واتایەکی نامێنێ لە چوارچێوەیەکی ڕەنگاو ڕەنگی بێ کەڵک بەولاوەو تەفرەدانی خەڵکی، نەک هەر ئەمەو بەس. بگرە ئەم چوار چێوەیەش شەق و شڕ ئەبێ بەدەست بێگانەوە چونکە کاربەدەستە دکتاتۆرەکان لە هەموو کاتێکدا ئامادەن کە بەرژەوەندیان ئەکەوێتە خەتەرەوە دەست لەگەڵ بێگانەدا تێکەڵ بکەن و سەربەخۆیی وڵاتەکەیانی بدەنە دەست بۆ پارێزگاری بەردەوام بوونی دەست درێژی خۆیان تا وای دێ سەربەخۆیی نیشتمانی لەناوەکەی بەولاوە هیچی تری نامێنێتەوە، بگرە لەهەندێ باردا ئەم ناوەشی نامێنێ، وەکو سەردەمی شایەتی دوابڕاو لەعێراقدا کە نۆکەری ئیمپریالیزمی بەریتانیا بوو، وە وەکو ئێران و تورکیا کە جووتە چلکاو خۆری ئیمپریالزمی ئەمریکان

جا کە سەربەخۆیی شوورایەک بێ بۆ پاراستنی هەموو مافەکانی گەل، وە بەهێزی و پتەوی ئەم شوورایە بەسترابێ بەو گەرەسەیەی لێی دروست کراوە، بەبێ گومان باشترین و خۆگیرترین گەرەسە هێزی گەلە، چونکە هەر خاوەن ماڵ ئەتوانێ ماڵی خۆی بپارێزێ، بەواتایەکی تر ئەو فەرمان ڕەوایی یەی لەگەڵ ئەوە هەڵقوڵابێ و گەل پشتیوانی بێ، وە هەر وەکو بەڵگە نەویستیشە هەر فەرمان ڕەوایی یەک بەڕاستی لە گەلەوە هەڵقوڵابێ و دڵسۆزی گەل بێ مافەکانی گەل ناخواو سەربەستی یە دیموکراتیەکانی پێسپێش ناکا، کەوابێ بەرەڵلا بوونی سەربەستی یە دیموکراتیەکان لە هەر وڵاتێکدا واتەی ئەوەیە کە گەل خۆی کاروباری خۆی ئەبا بەرێگاوە، وە واتای ئەوەشە کە سەربەخۆیی نیشتمانی بەدەست هێزێکەوەیە کە لەوانە نی یە تۆزقاڵێکی بەبێگانە ببەخشێ.



کەواتە ئەگەر بمانەوێ بزانین سەربەخۆیی هەر نەتەوەیەک تا چ ڕادەیەک تەواوە پێویستە وورد ببینەوە لە ژیانی ناو نەتەوەکە خۆی، تا چ ئەندازەیەک تیایا دیموکراتیەت بەرەڵلا کراوە؟ چۆن دەستەڵاتەکانی دەوڵەت دابەش کراون پەیوەندیان لەگەڵ یەکدا؟ لەسەر چ پرۆگرامێک سامانی نیشتمانی بەکار ئەهێنرێ و دابەش ئەکرێ؟ ژیانی کۆمەلایەتی و تەندروستی و ئەقافی لە چ پلەیەکدایە لەپێپلیکەی پێش کەوتندا،

وەلامی ئەم پرسیارانە ناتەواوی یا تەواوی سەربەخۆیی نیشتمانی هەر نەتەوەیەکمان بۆ دەرئەخا، وە بەکورتی ئەیلێینەوە کە ڕادەی سەربەستی هەر نەتەوەیەک پێوانەی سەربەخۆیی نیشتمانی یە.

*ڕۆژی نوێ ژمارە (٤)
ساڵی (٢) تەموزی ١٩٦١

# دیمانەیەک لەگەڵ محرم محەمەد ئەمین

دیدار: مستەفا صالح کەریم

***: مامۆستا -محرم - ئەمانەوێ بزانین سەرەتای ژیانی ئەدەبیتان لەکەیەوە دەست پێ ئەکات؟**

-: سەرەتای ژیانی ئەدەبیم لەچلەکانەوە دەست پێئەکا لە ساڵی ١٩٤٨دا هەندێ لە چیرۆکەکانی گۆرگی -و- گۆگۆڵ -و چەند چیرۆک نووسێکی جیهانی ترم کرد بەکوردی و بەرە بەرە لە ڕۆژنامەی -ژین- و -هەتاو- دا بڵاوم ئەکردنەوە، لەگەڵ هەندێ وتاری ئەدەبی و کۆمەڵایەتی

***: مامۆستا ئێوە بۆچی چیرۆکتان هەڵبژارد لە ئەدەبدا، بۆچی شیعر یاخود شتێکی ترتان هەڵنەبژارد؟**

-: چونکە بەڕای من چیرۆک لەهەموو بەشەکانی تری ئەدەب دەرفەتی زیاترە بۆ شیکردنەوەی ژیانی کۆمەڵایەتی و ئاشکرا کردنی کەمو کوڕیەکان و دیاری کردنی ڕێگای چارەسەر کردنیان.

***: مامۆستا چیرۆک لای ئێوە بریتیە لە چی؟**

-: بەلای منەوە چیرۆک بریتییە لە ئادەمیزادو کارەسات و کات بەتێکەڵ بوون دروست دەبن بەیەکدا چوونی ئەمانەو ئەو کۆک و ناکۆکیانەی لێوەیان پەیدادەبێ، جا لێرەدا نرخی چیرۆک لەڕووی تەکنیک و داڕشتن و ئامانجەوە دەگۆڕێ بەپێی بەهرەو شارەزایی و ئایدۆلۆژی نووسەرەکە

***: مامۆستا محرم، لەسەرەتادا کێوون ئەو چیرۆکنوسانەی کاریان تێ کردی؟**

-: ئەو چیرۆک نووسانەی لە سەرەتادا کاریان تێ کردم ئەمانەن: گۆرگی، گوگول، ئەناتول فرانس دیکنز، نجیب محفوظ.

***: باشە.. جیاوازی چیە لەنێوان چیرۆکی پەنجاکان و چیرۆکی ئەم سەردەمەدا، بەو سیفەتەی کە جەنابتان یەکێکن لەو چیرۆکنووسانەی لە پەنجاکانەوە چیرۆک ئەنووسن؟**

-: بەبێگومان، لەپەنجاکانەوە تا ئەم سەردەمە گۆڕینێکی قوڵ ڕویداوە، لە ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابووریماندا ئەمە کارێکی گرنگی کردۆتە سەر بەرهەمی ئەدەبیمان بەجۆرێکی گشتی وە بەرهەمی چیرۆک بەتایبەتی. لەپەنجاکاندا چیرۆک بەشێوەی هونەری تازە سەری دەرهێنا وە ژیانیشمان لە ڕادەی ئێستادا نەبوو. چیرۆکی پەنجاکان لەڕووی بابەت و شێوەوە پڕ بەپێستی ئەو سەردەمەبوو لەڕووی شێوەوە ڕێگای گێڕانەوە یانی -سەرد-ی ئەگرت، لەگەڵ ڕاوێژو ئامۆژگاریەکانی نووسەر کە دەیناخنیە چیرۆکەکەیەوە بەواتا پێش کات لەشێوەی حکایەت ڕزگاری نەبوو بەڵام چیرۆکی ئەم سەردەمە تا ڕادەیەک لەڕووی داڕشتن و شێوەو ناوەڕۆکەوە لەو قاڵبە ڕەت بووە

***: باشە ئێوە وەک چیرۆک نووسێک کە لەپەنجاکانەوە چیرۆک ئەنووسن و ئێستاش هەر چیرۆک ئەنووسن، ڕاتان چی یە بەرامبەر بەتازە کردنەوە لەچیرۆکی کوردیدا؟**

-: وەکو دەزانین ژیان هەمیشە لەتازە بونەوەو گەشە کردندایە ئەگەر چی جارو بارە هەندێ قۆرتی دێتە بەر، چیرۆکیش کە لەژیانەوە هەڵئەقوڵێ لەم یاسایە بەدەر نابێ بەڵام بەداخەوە هەندێ لە

ڕەنجدەرەکانمان دەیانەوێ لەسەر ئەو واقیعەی تیا دەژین بەزۆرە ملێ بازیدەن لەبەر ئەوە بەرهەمەکانیان دەبێتە لاسایی کردنەوەی بەرهەمی نووسەرە بێگانەکان بەڵام بەشێوەیەکی کاڵو کرچی بێتام، وەك کورد گوتەنیەکەی بەسەر دا دەگونجێ کە دەڵێ: ((کەر لەکوێ کەوتووەو کونده لەکوێ دڕاوە)).

***: باشە مامۆستا هەر لەسەر ئەم پرسیارەوە پرسیارێکی تر هەیە هەندێك بەناوی تازە کردنەوە چیرۆکی وا ئەنووسن کەخوێنەر تێی ناگات تۆ ڕات چیە بەرامبەر بەم دیاردەیەو بەتەمو مژی دەستکرد لەچیرۆکدا!!**

-: ئەم تازەکردنەوەیە ئەگەر سروشتی بێت، یەعنی تەبیعی بێت وەبگونجێ لەگەڵ قۆناغی ئێستامانداو دووربێت لەلاسایی کردنەوەی کوێرانە؛ شتێکی ئەك هەریگرە بەجێیە بەڵکو پێویستە، بەڵام مەسەلەی تەمومژ ئەوە بەڕای منەوە کەشتێك نیە لەجێی خۆیدا بێ چونکە ئێمە کە چیرۆك دەنوسین دەبێ هەموو زۆربەی خەڵکی تێی بگات، من کە تەمومژم بەسەر چیرۆکەکەدا دا مانای ئەوەیە یان کەس تێی ناگا- دەبێ خۆم چیرۆکەکەم بۆ خەڵك شەرح بکەم، یا ئەگەر تێشی بگەن دەستەیەکی زۆر کەم تێی دەگا کە سوودێکی ئەوتۆی نابێ

****: کاك محرم، ئاسۆی ڕۆشنبیری ئێستا چۆن بەدی ئەکەن!**

-: من باوەڕم بەپێشکەوتن و گەشە کردن هەیە، ئەگەر چی جارو بار بەموەقەت کۆسپ و گیرو گرفت دێتە پێشەوە لەبەر ئەوەی ئاسۆی ڕۆشنبیری کوردی بەرەو گەشە سەندن دەڕوا.

***: کاك محرم، ئێستا دەتانخەینە سەر کورسی دانیانان، ڕات چیە بەرامبەر بەم چیرۆکنووسانە! جەمال بابان!..**

-: نا تەوانم وا بەسەر پێوە وەڵامی ئەم پرسیارەتان بدەمەوە، ئەمە ڕێکەوبوونێکی دوورودرێژی دەوێ، خوا یاربێ لەدەرفەتێکی تردا بەیەك دەگەینەوەو وەڵامی ئەم پرسیارەتان ئەدەمەوە.

(بەڵام مامۆستا ئێمە ئامانەوێ بەدرێژی تۆ تەحلیلی چیرۆکەکانیان بکەیت، شی بکەیتەوە. ڕات، ئەم چیرۆکنووسە سەرکەوتووە؟ چۆنە؟ وەکو بروسکە پێمان بڵێ.

*بەخوا ئەزانی چییە.. ڕاستت دەوێ ئەوانە هەر ج کەسە دەوری خۆی نواندووە، بەعزێکیشیان هێشتا دەوری خۆیان هەیە، بەعزێکیشیان دەوری خۆیان بووەو هەیە بەعزێکیان لەپەنجاکاندا، بەعزێکیان تازەن، لەبەر ئەوە وەکو وتم ئەمانە لێکۆڵینەوەیەکی دەوێ بەراوردی بەرهەمیان پێویستە بکرێ لەگەڵ یەکدا، بزانین ئەوانە ئایا لە ڕووی تەکنیکەوە، ئایا لەڕووی داڕشتنەوە، لەڕوی هێنەوە شتێکی تیا هەیە، ئەمیان کەمو کوڕی تیا هەیە، ئەویان هەروەکو ووتم: لەوەپێش بەعزێکیشیان تەمو مژی تیا هەیە، ڕونکردنەوەی ئەوێ، ئەمانە جارێ وەختی نیە.

***: بەڵام، هەرچۆنێك بێت لەسەر کورسی (ئیعتراف) دانانیشی!**

-: ناوەڵڵا. مەسەلەکە عیلاقەی بەدیراسەیەکی مەوزوعیەوە هەیە.

***: ئەو بەرهەمانەی کە تائێستا چاپت کردوون کامانەن!**

-: ئەوبەرهەمانەی تا ئێستا چاپم کردون ئەمانەن، مام هۆمەر، گۆمی شڵەقاو، ئادەمیزاد، شای قەرەجەکان، گردی شەهیدان، یادی گۆڕستانەکە (وەرگێڕدراوە).

***: ئەی ئێستا چیتان بەدەستەوەیە!**

-: ئێستا چیرۆکێکی درێژم بەدەستەوەیە، دەمەوێ لەگەڵ چەند چیرۆکێکی تردا کە لە گۆڤارو ڕۆژنامەکاندا بڵاوم کردونەتەوە کۆیان بکەمەوەو لە دووتوێی کتێبێکدا چاپیان بکەم.

***: ئەمەی بەدەستەوەیە وەکو بڵێن: چیرۆکی درێژە یا ڕۆمان!**

-: ڕۆمان

***: جا کە ڕۆمانە بۆ بەجیا بڵاویان ناکەیتەوە، بۆ لەگەڵ ئەوانە تێکەڵیان دەکەی، ئەوانەی تر بە کۆمەڵێکی تر بەجیا ئەویش بەجیا!!**

و: بەخوا ئەوی بەدەستمەوەیە نیازم هەیە بیدەم بەکۆڕی زانیاری کوردی، جا ئەوان کەیفی خۆیانە یا جیای ئەکەنەوە یا بەیەکەوە چاپیان ئەکەن.

***: جا تۆ ئەتوانی بەجیا چاپیان بکەی.**

-: وەڵڵا بابزانم

***: مامۆستا محرم بەوسیفەتەی لەیەکەم ڕۆژی دامەزراندنی یەکێتی نووسەرانی کورد-دا لە سلێمانی جەنابتان ئەندامی دەستەی بەڕێوەبەری لق بوون، ڕات چیە بەرامبەر بەدەوری یەکێتی لەگەشەکردنی ئەدەبی کوردیدا..**

-: گومانی تێدانیە کە یەکێتی ی نووسەرانی کورد دەورێکی زۆر بالای هەبووەو هەیەتی لەگەشەپێدانی ئەدەبی ی کوردیداو زیندوکردنەوەی کەلەپوری نەتەوایەتیمان.

***: کاك محرم-ئایا موتابەعەی بزوتنەوەی ڕۆشنبیری لە گۆڤارو ڕۆژنامەکاندا ئەکەن!**

-: بەڵێ موتابەعەی دەکەم، بەداخەوە بەشێکی کەمی لێ دەرچێ ئەوانی تر نەك هەر بەبەرهەمی ئەدەبی ی ناژمێردرێن بەڵکو لەئاستی ووتارێکی ئاساییشدا نیە ئەمەش خەتای گۆڤارو ڕۆژنامەکانمانە بەناوی هاندانەوە دەرگا یان کردۆتەوە بۆهەرکەسێك دەستی قەڵەم بگرێ، بەلای منەوە ئەمە جەورە لە ئەدەبی کوردی دەکرێ، وە جەوریش لەو لاوانە دەکرێت گوایێ لەپڕ بوون بە ئەدیب و نووسەر.

***: کاك -محرم- ساڵی ١٩٥٧-١٩٥٨ ساڵێك بوو بەپێی ئەو بارو زرووفە دەورێکی گرنگی هەبوو لەبڵاوکردنەوەو بزوتنەوەی ئەدەبی کوردیدا، ئێوە ڕاتان چیە!**

-: بەڵێ منیش لەو باوەڕەدام ساڵێکی بەهات بوو بۆ ئەدەبی کوردی و بەتایبەت لەکۆتایی ساڵی ١٩٥٧دا تا کۆتایی ساڵی ١٩٥٩.

***: کاك محرم- ئێمە پرسیارمان زۆر کرد ئێوە هیچ پرسیارێکتان هەیە، ئێوە هیچی تر هەیە کە بیڵێن لەم بەرنامەیە.!**

-: بەڕاستی مامۆستا، پرسیارەکانت هەموو لایەنێکی گرتەوەو هیچی تری وانیە بیڵێم تەنها ئەوەندە نەبێ، خۆزگە وەکو جاران گۆڤارێك یان ڕۆژنامەیەك لەشاری سلێمانی دەردەچوو وە دەزگای ڕۆشنبیری و کۆڕی زانیاری کوردی و وەزارەتی ڕاگەیاندن زیاتر یارمەتی ئەدیب و نووسەرەکانیان ئەدا بۆ چاپ کردنی بەرهەمەکانیان.

*ئەم چاوپێکەوتنە ساڵی ١٩٨ لە ڕادیۆی بەغدا بۆ بەرنامەی شەوچەرەی ئەدەبی ساز کرابوو.

محرم محەمەد ئەمین

## نووسەرو چیرۆك نووس

تلعیر سالح سەعید

(محرم محەمەد ئەمین) هەروەك چۆن نووسەرو چیرۆك نووسێکی ناسراوو دیار بو، هەر بەو پێیەش پیاوێکی دڵسۆزو ڕۆشنبیرو نیشتمان پەروەر بو. لەسەرەتای لاویەوەو بگرە لەو کاتەوەی قۆناغی سەرەتایی تەواو کردبوو وتازە پێی نابووە قۆناغە ناوەندی. لەتەك هەندێك لەهاوەڵەکانیدا کە هەر لەتەمەنی خۆیدا بوون، لەوانە (محەمەد قودسی) لەبیرو لێکدانەوەی ئەوەدا بوون بتوانن کۆمەڵەیەك، ڕێکخراوێك لە لاوانی دڵسۆزو نیشتمان پەروەری ئەو ڕۆژە پێك بێنن. تا بەهۆی ئەو (ڕێکخراو) یان (کۆمەڵە)وە بتوانن لاوانی کورد لەپەرش و بڵاوی ڕزگار بکەن.

ئەوەبوو دوای چەند جارێك کۆبوونەوەو ڕاگۆڕینەوەو ڕاوێژکردن و تەقەلای زۆرو بێ وچان. کۆمەڵی (یەکێتی)یان پێك هێنا. ئامانجێك لە ئامانجەکانی پێك هێنانی ئەو کۆمەڵە ناساندنی گەلی کورد بو بەگەلانی دنیا. ئەویش لەڕێگەی پڕۆتستۆیەکەوە بو کەئەو کۆمەڵە دایانە ئەو باڵیۆزخانانەی لەعێراقدا بوون. دژی ڕەفتاری نامرۆڤانەی تورك کە لەو سەردەمەدا لەتورکیادا پیادە دەکرا.

لەساڵی ١٩٣٨دا (محرم محەمەد ئەمین) لەسەر پێشنیاری شەهید (محەمەد قودسی) پەیوەندی کرد بەکۆمەڵی (خۆی بوون) ەوە. ئەو پەیوەندی کردنەش لەڕێگەی (عوسمان سەبری)یەوە بوو، کە بەئەسڵ خەڵکی کوردستانی سووریە بوو ولەڕیزی پێشەوەی نیشتمان پەروەران دا بوو. ئەوەبوو جارێك (عوسمان سەبری) چل ئاڵای بچووکی (بەرۆك)ی، کوردستانی گەورەی بۆ ناردن. تا ئەمو هاوەڵەکانی و ئەوانەی سەر بەمان لەشوێنە گشتی و بۆنە نیشتمانیەکاندا بەبەرۆکیانەوە بکەن و بەرچاوی خەن.

هەر لەو ساڵەدا، واتە لە ساڵی (١٩٣٨)دا (محرم محەمەد ئەمین) لەسەرداوای کۆمەڵی (برایەتی) بوە ئەندام لەو کۆمەڵەدا. بەڵام ئەوەبو زۆر لەگەڵیاندا نەمایەوەو لێیان جیابووەوە. بەهۆی ئەوەوەی ئەو کۆمەڵە هەمە جۆر لەخەڵکی توێژو چینە جیاجیاکانی لەخۆی کۆکردبووەوە. دووا جار لەسەر داواو زۆری شەهید (محەمەد قودسی) کە ئەو کاتە قوتابی بو لەبەغدا، پەیوەندی کرد بە کۆمەڵی (هیوا)وەو بووە ئەندام لەو کۆمەڵەدا. ئەو کۆمەڵەی ئامانجێك لە ئامانجەکانی ڕزگار کردنی کوردستان بوو، ئەو کۆمەڵە گەلێك ڕۆشنبیرو ئەفسەرێکی زۆری لەخۆی کۆکردبوورەوە.

(محرم محەمەد ئەمین) پیاوێکی هێمن و لەسەر خۆ بو. هەمیشە بیری دەکردەوە، دڵسۆزبو بەووڵات و نەتەوەکەی. (لەگەڵ شەهیدی ئەمر حەمە قودسیدا) نموونەیەکە لە نووسینەکانی. کەباس لە قۆناغێکی زووی تەمەنی دەکات و، لەژمارە (٣)ی ساڵی ١٩٦٠ی گۆڤاری (ڕۆژی نوێ)دا بڵاوبۆتەوە.

# گوزەرانی تاڵ و مەینەتییەکانی ژیان و هەنگاوێك بەرەو شارەکان

عومەر مارف بەرزنجی

سالانی پێش ئەمڕۆ ڕۆژگارێکی تاڵ و بەیەکاچوبو. سیستمی ولات بەسترابو بە پاشکۆی ئیمپریالیزم و پەیمانە دەوڵەتییەکانەوە سامان و بەری ڕەنجی زۆربەی گەل بۆ دەستەییەکی تایبەتی بوو، جەماوەریش نەبوونی و کوێرەوەری بەبالایاندا برابو، جوتیارانیش لەزەوی خۆیان بێبەشکرابون و هەر ڕۆژەی لەشارو گوندێکا دەگیرسانەوە، کرێکاران لەبەر بێکاری ستەم و ئەشکەنجەیان دەنۆشی. لەم زروفە ئاڵۆزو تایبەتییەدا نوسەرانی ئەو سەردەمە هاوبەشییەکی نزیکیان کردوە لەگەڵیانداو ئەو دەردو ئازارو پەژارەیەیان لەڕێگای نوسینەوە دەربڕیوە. پاڵەوانی چیرۆکەکانیش تێکڕا هەژارێکی ڕاستەقینەن کە بەختەوەرییان لێ زەوت کراوە. لە لایەکی ترەوە نوسەرانی کورد لە ناوەڕاستی پەنجاکانەوە تەنها بە مەسەلەی جوتیار و دەرەبەگی لادێوە نەوەستاون بەڵکو هەنگاوی تازەیان ناوەو ڕویان کردوەتە چینە هەژارەکانی ناو شارەکانی کوردستان، وەك بیانەوێ ئەوە بسەلمێنن کە ڕژێمی نیمچە دەرەبەگایەتی تەنها دوژمنی هەژارو روتەکانی لادێ نییە، چونکە دەسەڵاتدارانی شارو لادێ بەرژەوەندییان پێکەوە گرێداوەو زۆربەی پاڵەوانی چیرۆکەکانیش دوچاری چەند داوێکی نەهامەتی بوون و ڕێگای ناڕەوایشیان هێنراوەتە بەردەم وەك دزی و لەش فرۆشتن و دیاردە ناشیرینەکانی هەمو کۆمەڵێکی دیل و دواکەوتو، کە بەمەیش ئەوەندەی تر توانای کەسەکانیان کەم کردوەتەوەو زوبەیشیان بەرەو داوی کوت و پڕ کۆتاییان پێهێنراوە. لەو نوسەرانەیش کەلەپێش هەموویانەوە لە دەرگای باسی ژیانی هەژارانی ناو شارەکانی داوەو ڕەوشتی بازرگان و سوخۆرو دەسەڵاتدارەکانی دەرخستوەو کرۆکی، نەتەوایەتیشی لە یادنەکردوە (محرم محەمەد ئەمین)ە.

ئەم نووسەرە کەرەستەی بابەتەکانی لەناو جەرگەی بێکارەکانی شارەوە دەرهێناوەو دەستنیشانی مرۆڤی پاکی کردوە. یەکێ لەهەوڵەکانیشی چیرۆکی (مام هۆمەر)ە کە بینای ئەدەبی خۆی لەسەر بنیات ناوە کە تاڕادەیەك ڕەنگی حەقایەتی کوردی پێوە دیارەو بەچەشنی سەرەتای کارێکی ئەدەبی هەندێ ئاڵۆزی و ئەگونجان بەدی دەکرێ لەنێوان ڕوداوەکاندا. سەرتاپا بابەتەکەیش نەخشەی خێزانێکی هەژارە کە بە نەبونی و گوزەرانێکی تاڵ ڕۆژگاریان بەرێکردوە. مام هۆمەر پیرەمێردێکی کوڵ هەڵگرەو لەبەر دەست کورتی ئەو ڕۆژەی ئەی توانیوە خۆراکی منداڵەکانی بەدەست بهێنێ: دەکەوێتە سەر ڕێی دزی کردن لەماڵی بایز بەگی دراوسێیان، لەم کاتەدا پێی دەزانرێ و ڕاپێچی بەندیخانە دەکرێ و بە سێ مانگ بەندی مەسەلەکەی دەبڕێتەوە. لەم ماوەیەدا لەبەر نەبوونی دەسمایەی ژیان (خەجێ)ی ژنی دەکەوێتە بارێکی ناهەموارەوەو برسێتی توانای لێ دەبڕێ. زۆریشی پێ ناچێ گەندەڵی باری کۆمەلایەتی ڕاپێچی دەکاتە مەیانی لەش فرۆشتنەوە لەم ڕێیەوە خۆی و منداڵەکانی لەدەست برسێتی قوتار دەکات. بەڵام دوای (٣) مانگ کەمام هۆمەر بەندییەکەی تەواو دەبێ لەکارەساتێکی کوت و پڕو ناخۆشدا دەمرێ و ژنەکەیشی بەدوایا، دو منداڵە ساواکەیشیان بەبێ کەس دەمێننەوە.

ئەم بابەتەی نوسەر نمونەیەکی سادەی سەدان خێزانی برسی و بێکارە بوەو کەسەکانیش لە جەرگەی واقیعی کۆمەڵەوە دەرهێنراون و مرۆڤی سینەپاکن، لەڕوێکی ترەوە دڕندەیەتی و ئەگریسی بەگەکانی ناو شار دەردەخات کە بایز بەگ یەکێکە لەوان کە لەڕوی چینایەتییەوە دو ڕوی ناڵەباریان هەیە. ڕوی دەرەبەگێك کە پەیوەندی بەزەوی جوتیارەوە بێ، هەروەها پەیوەندییان بە بازاڕی کشتوکاڵ و بازرگانی گشتی و مەلەو سو. نوسەریش ئەم جۆرە کەسانەی وەك مرۆڤێکی خوێن مژو چارەڕەش هێناوەتە سەر شانۆی ژیان کە سێبەری مرۆڤایەتی بەلایاندا گوزەر ناکات، بۆ ئەمەیش مام هۆمەر لەکاتی لێپرسینەوەدا دەڵێ ( بۆ من ئەگەر قاپێ چێشت بەرم لەو چێشتەی کە بەرەنجی ڕەش و ڕوتی گەڵ کەسانی وەکو من هاتوتە بەرهەم بەدز دەدرێمە قەڵەم؟ ئەی بایز بەگ بۆ بەدز نادرێتەقەڵەم کە بەری ڕەنجی هەزاران هەژاری بە زۆرە ملی دەخوا)؟ کە ئەمەیش تروسکایی ئەو هەستی جیاوازی چینایەتیە بەشەوق تر دەکات کەلە نێوان چینەکانی گەلدایە.

لەڕوی چوارچێوەی گشتی چیرۆکەکەوە نوسەر بەچەشنی بابەتەکانی ئەو سەردەمە پاڵەوانی چیرۆکەکەی بەرەو هەوراز و هەڵدێری بەسام بەرێکردوە کە نەتوانن بیبڕن و دەستی هیوا بگرن. ئەوەتا هۆمەر خراوەتە زەلکاوی دزیکردنەوەو، خەجێی خێزانیشی ڕێگایێکی دژوارتر. کە ئەمانە هێندەی تر تاڵی بەسەر هاتەکانی گرژ کردوەو نەتوانراوە کە ڕێگەی دروستی ژیان بدۆزنەوە هەرچەندە مرۆڤی پاك و سادەن

نوسەر دوای چەند ساڵێکی کەم بەسەر ئەم بەرهەمەیدا هەنگاوی خێراتری ناوە لە مەیدانی چیرۆکدا، گەر لە (مام هۆمەر)یشدا ئەی توانیبێ کە بنکەی چیرۆك بەباشی بچەسپێنێ و قەڵەمی هۆشی لەکێشانی هێڵی درشتی ڕوداوەکاندا زاڵ بێ، ئەوا لە هەنگاوەکانی تریدا وردتر بۆ کارەسات و مەودای هونەری چیرۆکەکانی ڕوانیوە. چیرۆکی (سەیرانێك لە ئەزمڕ) سەرکەوتنێکی ئاشکرایە لەم مەیدانەداو کەسانی چیرۆکەکەیشی نابەستێتەوە لەچەرخێکی تەسکی تایبەتیدا بەڵکو ماوەیان دەخاتە بەردەم و وازیان لێدەهێنێ کە لە بزوتنەوەیێکی بەردەمدا بن و بتوانن ڕەنگی گیرو گرفتەکانیان بڕێژن و کرۆکی ناگزۆرییەکانی ژیان بهێننە سەر دەستگای شیکردنەوەو بەرچاوخستن، بەشدارانیش تێکڕا مرۆڤی ساکاری کۆمەڵی کوردەوارین. نوسەریش بە وەستایی بەناخیانا ڕۆچوەو ڕوی کۆمەلایەتی هەریەکەیانی خستۆتە پێش چاو، لەناو بەرگ و کالایێکی شڕو پەککەوتەدا، لەدیمەنێکی شێواو ونائاسایی و قۆشمەییدا سیمای دەرون پاکی و خۆزگەی پیرۆزی دەرهێناون و چمکێکی ژیانی چەوساوەو بێکارەکانی شاری هەڵداوەتەوە. بەتێڕوانینێکی گشت لایی و خوێندنەوەیێکی بەمەبەست دەگەینە ئەو قەناعەتەی کە چیرۆکنوس توانایێکی بەربلاوی هەیە لە پیشاندانی سەرو سیماو هەڵس و کەوت و ڕەوشتی مرۆڤی کورددا، لە لایێکی ترەوە نوسەر وەك لەم چیرۆکەو (زیندوی مردو)دا دەردەکەوێت کە زۆر جار ویستوێتی کەسانی هەڵبژێری و جڵەوی ڕووداوەکانی بدا بەدەستەوە کە سەرچاوەی گاڵتەبازی و پێکەنین بن وەك بیەوێ تەعبیر لە ناڕەزایی مرۆڤی کورد بکا بەرانبەر بەو ژیانە، چیرۆکی (زیندوی مردو)یش تابلۆیێکی هەوڵ و تێکۆشانە لەشێوەیێکی ڕەمزیدا بۆ هیوایێکی دیاریکراو بۆ بەگژاچونی نوێنەرانی زوڵم و ستەم و هانی جەماوەر دەدات بۆ تەقینەوە بەڕوی ئەوانەی کە زۆربەی گەل دەچەوسێننەوەو بەمەبەستی فڕێدانی کاژی دواکەوتن و خەوانەی کە زۆربەی گەل دەچەوسێننەوەو بەمەبەستی فڕێدانی کاژی دوا کەوتن و خەو لەخۆخستن، چونکە (بزوتنەوەی بێ ئامانج بەهیچ کلۆجێ مانای ژیان نابەخشێ).

*لە کتێبی لێکۆڵینەوەو بیبلۆگرافیای چیرۆکی کوردیا وەرگیراوە


مام هومەر
محرم محمد امین
محمد مەمەندی دواساز
چاپخانەی کوردستان
١٩٥٤


محرم محمد امین
گومی شلەقاو


١٩٧٢
نرخی ( ١٤٠ ) فلسە




ستویفسکی
یادی
گۆڕستانەکە
بەشی یەکەم
وەرگێڕی محرم محمد امین


محرم محمد امین
ئادەمیزاد
ساڵی ١٩٦٩


ژمارەی داهاتووی (ڕۆڤار) تایبەتە بە
دڵداری شاعیر

